فەرهەنگی تەکنۆلۆژیای زانیاری
www.zkurd.org

# زانستپەروەرانی کورد

وەشانی ٢

# پێداچوونەوە و هەڵسەنگاندنی

ئەکادیمیای کوردی - هەولێر

**ناوی کتێب:** فەرهەنگی تەکنۆلۆژیای زانیاری- زانستپەروەرانی کورد
**وەشان:** دووەم
**بەرگ:** حامید ئەحمەد
**پیتچنین:** ئاراس، دیاکۆ
**پێداچوونەوە:** ئەکادیمیای کوردی
**ساڵی چاپ:** ٢٠١١
**ناونیشانی سەرهێڵ:** www.zkurd.org/proje/ferhengdev.pl

# پێشەکی

"زانستپەروەرانی کورد" گرووپێکی پێکهاتوو لە کوردانی دانیشتووی وڵاتە جۆربەجۆرەکانە کە لە ساڵی (٢٠٠٣)وە، بە هەرەوەزی و تاک، کارەکانیان بەشێوەی "سەرهێڵ online" لەسەر "www.zkurd.org" پێشکەش دەکەن. هەر پڕۆژەیەک دەستەیەکی تایبەت بەخۆی هەیە. ئەم وشەنامەیە کە نزیکەی (١٧٠٠) زاراوە لەخۆ دەگرێت، بەرهەمی "دەستەی پڕۆژەی فەرهەنگی ئایتی"یە، کە ماوەی چەند ساڵێکە لەسەر ئینتەرنێت ئامادە کراوە و، ئێستاش وەشانی یەکەمی بەشێوەی پەڕتووکێ لە بەردەستی ئێوەی هێژادایە.

بە کەڵکوەرگرتن لە ئەزموونی زمانە جۆربەجۆرەکان، بەتایبەت زمانە ئەورووپییەکان و، هەروەها بە ڕەچاوکردنی یاسا و ڕێسای زاراوەسازیی کوردی، کۆمەڵێ زاراوە و چەمکی نوێ داهێنراون کە بوونەتە هۆی دەوڵەمەندکردنی زمانەکەمان. هەندێ لە زاراوەکان بە پێناسە و ڕاڤە، زیاتر ڕوونکردنەوەیان بۆ کراوە.

وەشانی یەکەم، لە کۆتاییی مانگی ٢٠١٠/٨ لەچاپ درا، لەو کاتەوە چ لە مەکۆی زانستپەروەرانی کورد (zkurd.org/meko) و چ لەڕێگەی پرسیار و وەڵام و پەیوەندییەوە گفتوگۆ لەسەر چەندین زاراوەی نوێدا کراوە و بەردەوام بووە، کە هەندێکیان لەم وەشانەدا دەبینیتەوە، ئاواتی ئێمە ئەوەیە کە لە وەشانەکانی داهاتوودا بگەینە ئاستی وڵاتە پێشکەوتووەکانی دنیا کە خاوەنی هەزاران زاراوەی تەکنۆلۆژیای زانیارین، بۆ ئەو مەبەستەش کارکردنمان بەردەوام دەبێت و گفت ئەدەین بە خوێنەران کە وەشانی داهاتوو دەوڵەمەندتر بکەین، بێگومان ئەم جۆرە کارانەش پشتیوانی و هاوکاریی هەموو تاکە کەسێکی

دەوێت، نەک بە تەنها زمانزان و زانستخوازان، بەڵکوو هەموو دەبێ پەرۆش بین بۆ زمانەکەمان.

بۆ هەر پێشنیار و لێدوانێکیش سەبارەت بەم فەرهەنگە، دەتوانن لە ڕێگەی پۆستی ئەلیکترۆنییەوە ڕەوانەی بکەن بۆ:
info@zkurd.org
خۆشحاڵ دەبین بەهەموو پەیامێک.

ئاراس نوری و دیاکۆ هاشمی

## پێزانین

سوپاس و پێزانینمان پێشکەش بە هەموو ئەندامان و میوانانی گرووپەکە دەکەین کە لە ئینتەرنێتدا بە تاکە وشەیەکیش یارمەتییان داوین. هەروەها بە ئەندامانی "دەستەی پڕۆژەی ئایتی" کە ڕێییان داوە ناویان لێرە بنووسین و لە وەشانی یەکەمدا چالاکانە کاریان کردوە:

دیاکۆ هاشمی، ئاراس نوری ئەحمەد، ڕاستی خەفاف، موستەفا عەلی، باران عەبدول، عەلی عەلی، دارا ماوەتی، بێستوون عەلی، بازیان ئەمین مەولوود، ئاری هۆشیار مەحموود، حامید ئەحمەد، ئاسۆ نادری، ئەحمەد محەمەد ڕەواندوزی، قارەمان حەمەسالح، سیامەند نەریمان.

هەروەها ئەندامانی تری دەستەکە کە ناویان لەم "بەستەر link"ەدا هاتووە:
(www.zkurd.org/itendam)

سوپاس و پێزانینمان پێشکەش بە (کۆمپانیای تارین نێت، وەزارەتی گواستنەوە و گەیاندن – هەرێمی کوردستان) دەکەین کە هاوکارییان کردین لە چاپکردنی وەشانی یەکەمدا.

سوپاس و پێزانینمان پێشکەش بە (ئەکادیمیای کوردی - هەولێر) دەکەین، کە ئەرکی پێداچوونەوە و هەڵسەنگاندنی ئەم فەرهەنگەیان لە ئەستۆ گرت و پێشنیاری جوانیان بۆ کردین.

دەستەی بەڕێوەبەرایەتیی زانستپەروەرانی کورد "دبزک"
2011-07-06

# ڕاژەی زمان لە زانستپەروەرانی کورد

هەمـــوو ئەو کـــار و پـــرۆژانەی کە کـــۆمەڵەی زانســـتپەروەرانی کـــورد کردوویانـــە، بەشـــێوەی ســـەرهێڵ (online) لە مـــاڵپەڕی (zkurd.org) دا هەن، بـۆ زیـاتر ئاشـنابوون لە خـوارەوە بەسـتەر (link)ی هەر یەکەیـان دەنووســین تــاکوو خــوێنەری کــورد بەئاســانی دەســتی بگــاتە بــابەت و بڵاوکراوەکانی زانستپەروەرانی کورد.

ڕێنووسی زمانی کوردی kurdish orthography

www.zkurd.org/diyako/renus

بگۆڕی کوردی لاتینی بۆ کوردی سۆرانی

www.zkurd.org/Amino

فەرهەنگی ئینگلیزی - کوردی (کوردی - ئینگلیزی)

www.zkurd.org/proje/en-ku.pl

چێکردنی ماڵپەڕ بە (HTML)

www.zkurd.org/diyako/m

فەرهەنگی تەکنۆلۆژیای زانیاری

www.zkurd.org/proje/ferhengdev.pl

زاراوەسازیی کوردی

www.zkurd.org/?Besh=witar&kar=asayi&jimare=353

زانستی وەرگێڕان

www.zkurd.org/?Besh=witar&kar=asayi&jimare=218

فێرگەی (PHP) بە کوردی

www.zkurd.org/diyako/php

تاقیکارییەکان

www.zkurd.org/?Besh=Taqikari

http://www.zkurd.org




رووکاری سەرکیی ماڵپەڕی زانستپەروەرانی کورد

# بەکارهێنانی ئەم فەرهەنگە

- ئەم فەرهەنگە ئینگلیزی کوردییە، شێوەی ڕیزکردنەکەی بە ئەلفوبێی ئینگلیزی دانراوە.
- ئەگەر وشەیەک چەند هاوواتایەکی هەبێ، خاڵبەند کراوە. بۆ نموونە:

**forward**[1] بینێرە بۆ

**forward**[2] بەرڕۆیی، پێشڕۆیی

**forward**[3] ١ـ بەرڕۆ، پێشڕۆ، ڕووبەپێش ٢ـ ڕاستەوخۆ

لێرەدا ٣ واتا نووسراوە بەرامبەر بە (forward).

- کورتکراوەکان زۆر کات بەرامبەریان بە کوردی نەنووسراوە، لەبری ئەوە بەرامبەر واتای کورتکراوەکە وشەی بەرامبەری بە کوردی دانراوە یان پێناسێکی بۆ کراوە. بۆ نموونە:

**int** = integer type

**integer type** جۆری تەواو

- ئەو زاراوانەی وشەی کوردییان بەرامبەر نییە یان وشەی نوێیان بۆ دانەتاشراوە، وشە ئینگلیزییەکە وەکوو خۆی لە ستوونی کوردییەکەدا لە کەوانەدا نووسراوەتەوە، هەوڵدراوە واتا و بەکارهێنانەکەی بە کورتی شی بکرێتەوە، بۆ نموونە:

**Telnet** (Telnet)، تێلنێت (ناوی بازرگانی. ئامێر و ڕایەڵەیەکی کۆن لە ئینتەرنێتدا، لەسەر بنەمای یونیکس، کە بۆ ناردن‌وەرگرتنی دەق و بەرنامە کار دەکات. بەکارهێنەر دەتوانێ ڕاستەوخۆ بچێتە نێو پێگەکانی تێلنێت و، لەگەڵ بەرنامەکانیدا ڕاستەوخۆ کار بکات).

# ژێدەرەکان

١ـ کەمالنامە، فەرهەنگی زانستی، عەرەبی ـ ئینگلیزی ـ کوردی، کەمال جەلال غەریب.
٢ـ فەرهەنگی ئازادی، ئینگلیزی ـ کوردی، د. حەمە ڕەشید قەرەداخی.
٣ـ فەرهەنگی گیرفانیی جاف، ئینگلیزی ـ کوردی، احسان علی.
٤ـ فەرهەنگی ئاکسفۆرد، ئینگلیزی ـ کوردی، سەلام ناوخۆش.
٥ـ فەرهەنگی زاراوەی زانستی، ئینگلیزی ـ عەرەبی ـ کوردی، مستەفا سلێمان.
٦ـ فرهنگ فارسی ـ کردی، دانشگاه کردستان، سه جلدی، ماجد مردوخ روحانی.
٧ـ هەنبانەبۆرینە، ، کوردی ـ کوردی ـ فارسی، مامۆستا هەژار، تاران.
٨ـ فەرهەنگی فیزیا، ئینگلیزی ـ عەرەبی ـ کوردی، نەوزاد عومەر محێدین.
٩ـ فەرهەنگی بیرکاری ـ ئینگلیزی ـ عەرەبی ـ کوردی، نەوزاد عومەر محێدین.
١٠ـ فەرهەنگی زاراوەکانی قوتابخانە، عەرەبی ـ کوردی ـ لێژنەی گۆڤاری پەروەردە و زانست.
١١ـ واژەنامە کامپیوتر، انگلیسی ـ فارسی، محمد رضا محمدی فر.
١٢ـ فرهنگ معاصر هزاره، انگلیسی ـ فارسی، علی محمد حق شناس، حسین سامعی، نرگس انتخابی.
١٣ـ فەرهەنگی خاڵ، کوردی ـ کوردی، سێ بەرگی، شێخ محمدی خاڵ.
١٤ـ فەرهەنگی کوردستان، کوردی ـ کوردی، گیو مووکریانی.
١٥ـ فەرهەنگی تەکنۆلۆژیای ئینگلیزی ـ ئینگلیزی ، whatis، (www.whatis.com).
١٦ـ فەرهەنگی ئینگلیزی ـ ئینگلیزی، چاپکراوی زانکۆی Oxford، Oxford Advanced learner`s Dictionary, Oxford university press
١٧ـ فەرهەنگی ئایتیی سویدی ـ سویدی، Pagina، (http://itord.pagina.se/).
١٨ـ فەرهەنگی سویدی ـ کوردی، (کوردیی خواروو)، Lexin، ڕێبوار ڕەشید.
١٩ـ فەرهەنگی سویدی ـ کوردی، مژدە خەلیل ڕەشید.

٢٠ـ زمانی یەکگرتووی کوردی، جەمال نەبەز.
٢١ـ پرۆژەی زاراوەی زانستیی کوردی، کەمال جەلال غەریب.
٢٢ـ بەرکولێکی زانستە زاراوەسازیی کوردی، جەمال عەبدول.
٢٣ـ زاراوە سازیی پێوانە، مەسعوود محەمەد.

# A, a

**A**[1] "ئەی" (ڕەنووسی شانزەشانزەیی، بەرانبەر ١٠ دەدەیی)

**A**[2] = archived

**A Programming Language** (= APL) زمانی پرۆگرامکردنی "ئەی"، (بنواڕە APL)

**A+** ئەیپڵەس (بڕوانامەی خوێندن کە لەلایەن کۆمپانیای بەریتانی (GTS Learning) دەردەچێ، لقیان لە زۆر وڵاتدا هەیە. بڕوانامەیەکی گشتییە بۆ تەکنیککارانی "کۆمپیوتەری تایبەت pc")

**a-bus** تێپەڕگەی "ئەی"، (تێپەڕگەی سەرەکیی ناوخۆیی لە "گچکەڕێکخەر mini processor"دا)

**a-ring** (= a-circle) "ئەیڕینگ"، ئەیبازنە، ئەی ئاڵقەدار، ئەی بازنەدار (پیتی "a" کە بازنەیەکی بچووکی لەسەرە، بۆ وێنە لە ئەلفبێی سویدیدا هەیە "å")

**a2b** ئەیتووبی (وێبگەیەک بوو کە ڕێی پێ دەدای بەشێک یان تەواوی گۆرانییەک لە تۆمارکراوە بەناوبانگەکان داگری و لێیان بدەیتەوە، مۆسیقالێدەرێکیان بەکار دەهێنا کە لەلایەن "AT & T" پەرەی پێ درابوو. ئەو وێبگەیە ئێستە نەماوە)

**A4** ئەی فۆر، ئاچوار (ستانداردی بڕگەی کاغەزی نووسینی ٢٩٧ x ٢١٠ میلیمەتر)

**A5** ئەی فایڤ، ئاپێنج (ستانداردی بڕگەی کاغەزی نووسینی ٢١٠ x

(١٤٨ میلیمەتر)

**A:** ئاجووتخاڵ (لە کۆمپیوتەری کەسیدا نیشانەی دیسکی نەرمی A)

**AAA** (= authentication, authorization, and accounting) سێ‌ئەی (ڕەسەنێتی، دەسەلاتپێدان و ژمێریاری)

**AAAI** (= American Association for Artificial Intelligence) تریپڵ‌ئەی‌ئای (کۆمەڵەی ئەمریکی بۆ زیرەکی دەستکرد)

**AAC** (= MPEG2-Advanced Audio Coding) ئەی‌ئەی‌سی (تەکنیکێکی پێشکەوتوو بۆ پەستانی دەنگ، زۆر جار پێی دەوترێ MP4)

**AB roll** خلۆریی ئەی‌بی، (لە ڕاگەیێنەکان "media"دا، دوو پارچە مۆسیقا یان ڤیدیۆ، کە وەها هاوهەنگاو بوون کە بە دەستپێکی یەکێکیان، ئەوی تریان "بزرۆ fade" دەبێ)

**abacus** چۆرت، ئەژمێر (چوارچێوەی مووروودار بۆ ژمارەکاری)

**abandon** وازلێهێنان، وەلانان (چوونەدەرەوە لە پەڕگە بەبێ پاشەکەوتکردنی)

**abandon text** وازلێهێنانی دەق، دەق‌وازلێهێنان (لە وشەڕێکخەریدا، پاشەکەوتنەکردنی بەئەنقەستی پەڕگە، بەمەبەستی گوێنەدان لە دەستکاری و گۆڕانکارییە کراوەکان)

**abandonware** فرێواڵە، بەرنامەواڵەی وازلێهێنراو (بەو نەرمەواڵە کۆمپیوتەریانە دەوترێن کە ئیتر نافرۆشرێن یان پاڵپشتی ناکرێن و لەبەر هۆی نادیار خاوەنی مافی لەچاپدانەوەکەیان ناڕوونە)

**abbr.** = abbreviation

**abbr. addr.** = abbreviated addressing

**abbreviate** کورتکردنەوە، کورتەکردنەوە

**abbreviated** کورتکراوە، پوختەکراو

**abbreviated addressing** (= abbr. addr.) ناونیشانپێدانی کورتکراوە

**abbreviation** (= abbr.) ١ـ کورتکردنەوە ٢ـ کورتە، کورتکراوە

**abbreviations** ١ـ فەرمانامەی کورتەکان ٢ـ کورتەکان

**abbreviation[s] file** پەڕگەی کورتەکان

**ABC**[1] (= Atanasoff-Berry Computer) ئەیبیسی (کۆمپیوتەری ئاتانازۆف- بێری، لە مێژووی کۆمپیوتەردا)

**ABC**[2] (= ABCs = ABSs') ١- ئەلفبێ ٢- بنەماکان ٣- پەڕتووکی سەرەتایی ٤- ئەلفبێی کار، سەرەتاکانی کار

**abend** (= abnormal end = abnormal termination) ١- ئابێند، کۆتاییپێهاتنی نائاسایی (کۆتاییپێهاتنی بەرنامە بەهۆی سەرهەڵدانی هەڵەیەکی نەرمەواڵەیی، وەکوو دابەشبوون بەسەر سفردا، یان هەڵەی ڕەقەواڵەیی وەکوو تەواوبوونی کاغەزی چاپگەر)
٢- کۆتاییپێهێنانی نائاسایی

**abend recovery program** بەرنامەی چێکەرەوەی "ئابێند" (ئەو نەرمەواڵەیەی کە بەرنامەی ڕاگیراو سەرلەنوێ دەخاتەوە کار)

**ability** توانا، لێهاتوویی

**ABIOS** (= Advanced Basic Input Output System) ئەیبایووز، ئەیبیئایئۆئێس (کورتەی دەستەواژەیەکی ئینگلیزییە کە بە کوردی دەبێتە "سیستەمی تێچوو دەرچووی بەیسیکی پەرەسەندوو" کە کۆمەڵێ لە ڕەوتە ڕاژەیییە سیستەمییەکانە لە کۆمپیوتەرەکانی ps/2 دا)

**abnormal** ناوازە، نائاسایی، ناسروشتی

**abnormally** نائاساییانە، ناسروشتییانە

**abort** ١- پچڕاندن، کوژاندنەوە ٢- لابردن، وەستاندن، کۆتاییپێهێنان (کۆتاییپێهێنانی بەئەنقەستی جێبەجێکردنی بەرنامە لەبەر سەرهەڵدانی هەڵە) ٣- کۆتاییپێهاتن (کۆتاییپێهاتنی جێبەجێکردنی بەرنامە لەلایەن سیستەمی کارپێکردنەوە)

**about…** سەبارەت... (زاراوەیەک کە زۆر جار لە بەشێکی سیستەمێکی "help"ی نەرمەواڵە یان ڕەقەواڵە دێت و پێناسە سەرەکییەکان و بەتایبەت "copyright"ی سیستەمەکە لە چەند دێڕدا پیشان دەدات)

**abridge** کورتکردنەوە

**abridged** کورتەیی (ئاوەڵناو)

**abridged version** وەشانی کورتەیی (لە پەڕتووک و دراوەدا)

**abridgement** کورتکاری، پوختەکاری

**abrupt** لەپڕ، لەناکاو، کوتوپڕ

**abscissa** ڕایەڵی ئاسۆیی، پۆ

**absolute** ١ـ ڕەها، بێپایان، بێجڵەو، بێسنوور، بەربەرەڵا ٢ـ تەواو

**absolute address** (actual address = machine address = direct address) ناونیشانی ڕەها، ناونیشانی پەتی، ناونیشانی ڕاستەقینە، ناونیشانی ماشینی، ناونیشانی فیزیکی (ناونیشانی ژمارەیی یان ڕەقەواڵەییی خانەکانی بیرگە، بە هەمان شێوە و بە هەمان ڕێکخستنێ کە لەلایەن گەڵاڵەدارێژ یان کارگە چێکەرەکانی دابین کراون)

**absolute addressing** ناونیشانپێدانی ڕەها

**absolute assembler** ئەسمبلەری ڕەها

**absolute code[1]** (= absolute program) بەرنامەی ڕەها، بەرنامەی ماشینی

**absolute code[2]** کۆدی ڕەها، نهێنیی ڕەها، نهێنیی کردەی ڕەها

**absolute disk address** ناونیشانی ڕەهای دیسک، ناونیشانی فیزیکیی دیسک

**absolute error** هەڵەی ڕەها، هەڵەی پەتی

**absolute instruction** (= actual instruction) ڕێکارنامەی ڕەها، ڕێکارنامەی پەتی

**absolute loader** بارکەری پەتی (جۆرە نەرمەواڵەیەکی سیستەمی)

**abstract[1]** ١ـ پوختە، کورتە (پوختەیەکی تێروتەسەل لە تەواوی ناوەڕۆکی "بەڵگەنامە"یەک بۆ وێنە کتێبێ یان وتارێ، کە بەگشتی بە دە وشەیەک تا سەد وشەیەک دەنووسرێتەوە) ٢ـ ڕووت، نەبینراو، نادیار ٣ـ پوختەکردن، کورتکردنەوە ٤ـ ڕووتکردن، بەڕووتی

**abstract**[2] ڕووت، لێدابڕاو

**abstract data-type** جۆرە- دراوەی ڕووت

**abstract specification** تایبەتمەندیی ڕووت
(تایبەتمەندییەکانی نەرمەواڵە و هی تر، کە بە زمانی "وێنەیی" دەردەبڕێن)

**abstractor** پوختەنووس، پوختەساز

**ACC** = accumulator

**accelerate** ١- تاودان، لەزپێدان، خێراکردن، گوڕپێدان
٢- تاوسەندن، لەزگرتن، گوڕگرتن

**accelerated** تاودراو، تاوگرتوو، لەزگرتوو، تاودار

**acceleration** تاو، لەز، گوڕ، خێرایی

**acceleration function** پابەندی تاو

**accelerator** تاودەر

**acceptance** وەرگرتن، وەرگیران

**acceptance number** (= ACCN) ژمارەی وەرگیران (لە کۆنترۆڵی چۆنیەتیدا)

**acceptance test** ئەزموونی وەرگیران، تاقیکردنەوەی وەرگیران

**acceptor** وەرگر

**access** ١- چوونەناو، دەستپێگەیشتن، ڕێی چوونەژوورەوە یا تێپەڕبوون ٢- مافی چوونەناو یان چوونەژوورەوە

**access arm** باسکی دەستپێگەیشتن، قۆڵی دەستپێگەیشتن
(لە دیسکلێخوڕدا، میکانیسمێکە کە کرداری خوێندن و نووسین دەباتە پێش و پاشەوە)

**access barred** دەستپێگەیشتنی نەلواو، دەستپێگەیشتنی ڕێپێنەدراو (لە پاراستنی دراوەکاندا)

**access charge** مزی دەستپێگەیشتن

**access code** (= password) تێپەڕوشە، تێپەڕەوشە

**accessibility** توانای دەستپێگەیشتن، دەستپێگەیشتەنێتی، توانای چوونەژوورێتی

**account** (= user account) هەژمار، هەژماری بەکارهێنەر (لە ڕایەڵەدا)

**accountancy** ژمێریاری

**accumulator** کۆکەر

**acoustic** (= acoustical) ١ـ دەنگی ٢ـ دەنگناسی، دەنگزانی، فەرمانامەی بێناونیشان، ڕێکارنامەی بێناونیشان

**acquire** بەدەستهێنان (ی مافی لەچاپدانەوە)، کڕینی ماف (ی لەچاپدانەوە) (لە پیشەسازیی بڵاوکردنەوەدا، مافی لەچاپدانەوەی پەڕتووک و نەرمەواڵە)

**acquiring editor** پێداچووی مافی لەچاپدانەوە

**Acrobat** ئەکرۆبات (ئەکرۆبات پرۆگرامێکە لەلایەن "Adobe" کە ڕێگە دەدات وێنەیەک لە بەڵگەنامەیەک بگیرێ و خشت وەک خۆی پیشان بدرێتەوە)

**acronym** سەروشە (یەکەم پیتی چەند وشەیەک پێکەوە)

**action** کردار، کار، کردە، کردەوە

**active** چالاک، کارا

**Active Server Pages** (= ASP) لاپەڕە ڕاژەکارە کاراکان

**Active Server Pages .NET** (= ASP.NET) لاپەڕە ڕاژەکارە کاراکان (وەشانی تایبەت بە سەکۆی ".Net")

**ActiveX** ئەکتیڤئێکس (ناوێکە مایکرۆسافت داویەتی بە کۆمەڵێک لە ئامراز و تەکنۆلۆژیای "بەرنامەسازیی تەنخواز object-oriented programming"ی گرنگ و پێویست. ~ بەردەوامیی دوو تەکنۆلۆژیای تری مایکرۆسۆفتە کە پێیان دەوترێ "OLE" و "COM" کە کورتەی **ئەمانەن**:
(**O**bject **L**inking and **E**mbedding) و (**C**omponent **O**bject **M**odel)

**AD [After Dark image]** (جۆرە درێژکراوەیەکی پەڕگە)

**Ada** (= ADA) ئادا، ئێیدا (جۆرە زمانێکی ئاستبەرز، خاوەنی هەلومەرجی بەرنامەسازیی گورجوگۆڵ)

**Ada language** زمانی ئادا، زمانی ئێیدا

**Ada programming** بەرنامەکردنی ئادا، بەرنامەکردن بە زمانی ئێیدا

**adapt** سازکردن، گونجاندن

**adapter** سازکەر، گونجێنەر

**add** خستنەسەر، کۆکردنەوە، پێوەنان

**add-on** ١ـ پێوەکراو، زیاترکراو، سەرخراو، زێدەکراو
٢ـ زیاترکەر، پێزیادکەر، وەسەرخەر

**address** ناونیشان

**address bar** تووڵی ناونیشان

**address bus** تێپەڕگەی ناونیشان

**addressless instruction** (= zero-addressed instruction)
فەرماننامەی بێناونیشان، ڕێکارنامەی بێناونیشان

**adminstration** کارگێری، بەڕێوەبەرایەتی، فەرمانگە

**adminstrator** بەڕێوەبەر

**advanced** پەرەسەندوو

**adware** بانگەشەواڵە، پرۆگرامی بانگەشە

**alias** ناسراو بە، نازناو، ناوی خوازیار، خوازناو

**aliasing** ١ـ خاوڕۆیی ٢ـ زیگزاگ، لابەلا

**align** هاوڕێکی، هاوهێڵی، هاوتەختی، لاڕێککردن، لاگرتن
(ڕێکخستنی دەق، وێنە، هتد، بۆ لای ڕاست، ناوەڕاست یان چەپ.)

**alignment** لاگرتن، ڕیزکردن

**alpha** ئەلفا (وەشانێکی بەرنامەیەک کە ئێستا نەکەوتۆتە بەردەستی خەڵکی، بەڵام بە مەبەستی تاقیکردنەوە هەیە)

**alphanumeric** ئـەلفـاژمـارەیـی

**alternate** لـەبری، جێگرەوە، بژارە

**analog**[1] (= analogoue) ١ـ بـەراوردی، پێوانـەیـی، بـەراوردکـارانـە (نـارەنووسی)

**analog**[2] (= analogoue) لێکچوو، هـاویـەک، هـاوتـا، هـاوشێوە، بـەرانبـەر (لـە کۆنترۆڵدا، بۆ وێنـە لـە سیستـەمی لێکچوودا)

**analog**[3] (= analogoue) ١ـ بـەراوردی، ئـامێری بـەراوردی، ئـامێری پێوانـەیی، ئـامێری بـەراوردکـارانـە (لـە بـەرانبـەر "ئـامێری رەنووسی")

**analog adder** پێزیـادکـەری پێوانـەیی

**analysis** شیکردنـەوە، شیتـەڵکـاری

**anchor** لـەنگـەر

**android** ئـەندرۆید (سیستـەمی کارپێکردنـە، بۆ ئـامێری گـەڕۆک و تـایـەپێژمێر پـەرەی پێدراوە)

**animation** جووڵاو، بزێو

**annotation** یـاداشت، پـەراوێزنووسی

**anonymous** نـەنـاسراو، نـەزانراو، بێنـاو، کـەسنـەنـاس

**antiglare** دژەبریقـە

**antivirus** دژەڤـایرۆس

**antivirus software** (= AVS) نـەرمـەواڵـەی دژەڤـایـرۆس (نـەرمـەواڵـەیـەک بۆ پاراستن لـە بـەرەنگاربوونـەوەی ڤـایرۆسی کۆمپیوتـەر کـە پـەی پێ دەبرێت.)

**Apache** ئـەپاچی (ڕاژەکارێکی وێبـە کـە بـەخۆڕایی و بـە شێوەی ژێدەرکراوە "opensource" لـەبـەردەستدایـە، یـەکـەم وەشـانـی سـاڵـی ١٩٩٥ بڵاو کراوەتـەوە، بۆ زانیـاریی زیـاتر بڕوانـە (www.apache.org

**API** (= application programming interface) ناوبەستی بەرنامەی بەکاربەری

**APL** (= A Programming Language) ئەیپیئێڵ (زمانی بەرنامەکردنی ئاستبەرز، ڕاڤەکەری هەیە و بۆ کاری بیرکاری چێ کراوە. هەلومەرجی زۆری هەیە بۆ ڕێکخستنی ڕیزەک "array"ەکان و چارەسەرکردنی هاوکێشە جەبرییەکان)

**App** (= application)

**append** پاشکۆکردن، لەتەککخستن

**Apple** "ئەپڵ" (ناوی بازرگانی. یەکێکە لە پێژمێرسازە گەورەکانی دنیا)

**Apple Computer** (= Apple-Macintosh Computer = Macintosh Computer) کۆمپیوتەری ئەپڵ، پێژمێری ماکینتۆش

**appliance** ئامێر، کەرەستە، دەزگا (هەر جۆرە ئامێرێکی کارەبایی و ناوماڵەیی)

**appliance computer** پێژمێری ئامادە، کۆمپیوتەری ئامادەی کار (پێژمێرێ کە پاش کڕین دەتوانرێ بدرێتە دەم کارەبا و هەڵ بکرێ و ئیشی پێ بکرێت)

**applicabillity** بەکاربەریخوازی- کردینی، کردارەکی

**applicable** بەکاربەریخواز

**applicant** داواکار، داخواز

**application[1]** بەرنامەی بەکاربەری، نەرمەواڵەی بەکاربەری، بەرنامە، نەرمەواڵە

**application[2]** ١ـ داوانامە، داخوازنامە ٢ـ پرۆگرام (ی پێژمێر) ٣ـ بەکاربەری، بەکارهێنان، کارپێکردن، خستنەکار ٤ـ کاری بەکاربەریی کۆمپیوتەر، کاری کردەنی، کارێ بکرێ ئەنجام ببێت

**application developer** بەرهەمهێنانی بەرنامەی

بەکاربەری، پەرەپێدانی بەرنامە

**application development language** زمانی بەرهەمهێنانی بەرنامەی بەکاربەری

**application development system** سیستەمی بەرهەمهێنانی بەرنامەی بەکاربەری

**application file** پەڕگەی بەکاربەری

**application form** فۆرمی داوانامە، فۆرمی داخوازنامە

**application generator** دینەمۆی بەرنامە

**application icon** وێنۆچکەی بەکاربەری

**application-oriented language** زمانی بەکاربەریخواز

**application package** گورزەی بەکاربەری، گورزەی نەرمەواڵەی بەکاربەری

**application program** = applications program

**applications program** بەرنامەی بەکاربەری (بەرنامەیەک کە بە مەبەستی بەکاربەرییێکی دیاریکراو دەنووسرێت، وەکوو بەرنامەی ژمێریاری، کۆگاداری، بانکداری و هتد)

**application programming interface** = API ناوبەستی بەرنامەی بەکاربەری (نێوانەڕوویەکە بۆ داڕشتنی بەرنامەیەکی بەکاربەری)

**applications software** نەرمەواڵەی بەکاربەری

**applications terminal** کۆتاگەی بەکاربەری

**applied** بەکاربەری، کردەنی، کردارەکی

**applied graphics** گرافیکی بەکاربەری، نیگارسازیی بەکاربەری

**apply** بەکاربردن

**approach** بۆ چوون، نزیکبوونەوە، لێنزیکبوونەوە، چوون بەرەو

**approval** ١ـ پەسەندكردن، مۆركردن، ڕەزامەندی ٢ـ بەدڵبوون، پەسەندكردن ٣ـ ئافەرین

**approve** ١ـ پەسەندكردن، مۆركردن ٢ـ بەلاوەباشبوون، ڕالەسەربوون

**approxe** = approximate

**approximate** ١ـ نزیک، لەیەکەوە نزیک ٢ـ وەک یەک، چونیەک ٣ـ نزیکەیی ٤ـ لێکچوون، لێککردن

**approximation** ١ـ لێکچوون، لێنزیکبوونەوە ٢ـ نزیکەیی

**arbitrary** ١ـ دڵویست، دڵخواز، بەمەیلی خۆ، لەڕووی ویستنەوە ٢ـ بێسەرووبەر، نابەجێ، لەخۆوە

**arbitrary constant** نەگۆڕی دڵویست، نەگۆڕی دڵخواز، لە خۆوەیی هەمیشەیی

**architecture** تەلارسازی

**archive** ئەرشیف

**archived** (= A) ئەرشیڤکراو

**area** ١ـ ناوچە، هەرێم، شوێن ٢ـ ڕووبەر، ڕوو، پانتایی ٣ـ بەستێن، بوار

**argue** ١ـ بەڵگەهێنانەوە ٢ـ مشتومڕکردن، چەندوچۆنکردن

**argument** ١ـ بەڵگە ٢ـ مشتومڕ، دەمەقاڵێ

**arithmetic** ژمێرەیی

**array** ڕیزەک، ڕیز

**arrow** تیر

**ascending** هەڵچوون، بەرزبوون، بەرزەڕۆیی

**ASCII** (= American Standard Code for Information Interchange)
ئاسکی، هێمای ئاسکی (جۆرە کۆدێکی حەوت بیتیی ١٢٨ نووسەییيە، کە بۆ ستانداردکردنی ئاڵوگۆڕی دراوەکان لەنێوان جۆرە جیاوازەکانی دەزگاکانی دراوەکاری و پێوەندییەکانی ڕەنووسی، گەڵاڵەڕێژی کراوە)

**ASCII character** نووسەی ئاسکی

**ASCII character set** کۆمەڵە نووسەی ئاسکی

**ASCII code** کۆدی ئاسکی

**ASCII file** پەڕگەی ئاسکی (پەڕگەیەک کە تەنها پێک هاتووە لە پیت بە ڕەمزەکانی ئاسکی)

**ASCII FTP mode** دۆخە FTP ی ئاسکی (یەکێک لە دوو دۆخەکانی گواستنەوەی دراوەکان لەڕێگەی FTP)

**ASCII keyboard** تەختەکلیلی ئاسکی

**ASCII string** ڕیزبەندی ئاسکی، ڕیزبەندی نووسەیی ئاسکی

**ASCII text** دەقی ئاسکی (دەقی پاشکەوتکراو بە داڕێژەی ئاسکی)

**ASP** (= Active Server Pages) لاپەڕە ڕاژەکارە کاراکان

**Assembly language** زمانی کۆکار، ئەسێمبلی (زمانێکی ئاستنزمی بەرنامەداڕشتنە)

**assertion** ١ـ سووربوون، داوا، خوازە، پێداگری ٢ـ دڵنیابوون

**associate** هاوپەیوەند

**at (@)** ئالوول، ئاـ لوول (تێبینی: بە هێمای (@) کە "a" یەکی لوولبووە دەڵێین "ئالوول". ئەو ئالوولە لە زۆربەی زمانە ئەورووپییەکاندا بەگوێرەی زمانی خۆیان گۆڕیویانە و ناوێکیان بۆ داناوە. بۆ وێنە لە سویدی پێی دەڵێن "ئای لووتەفیلی" و لە فینلەندیش پێی دەوترێ " ئای کلکەمەیموونی". ئەگەر ناونیشانێکی ئیمەیلێکمان بۆ وێنە بەم شێوەیە هەبێ "info@zkurd.org" ئاوا دەیخوێنینەوە: "ئینفۆ، ئالوول، زکورد، خاڵ، ئۆرگ")

**attachment** پاشکۆ ، هاوپێچ

**attempt** هەوڵدان

**attribute** ١ـ تایبەتمەندی، ئاکار، تایبەخۆ، پێناسە ٢ـ دانەپاڵ

**audio**[1] بیستەنی، بیستنی

**audio**[2] دەنگ

**audio frequency (= AF)** لەرەلەرەی بیستەنی

**Audio-Video Interleave file** (= AVI) پەڕگەی بیستن و گرتە (پەڕگەیەکە کە دەنگ و گرتەی ڤیدیۆیی تێدایە)

**audit** پێداچوونەوە، لێپرسینەوە، پشکنین، وردبین

**authentication** ڕەسەنێتی

**authorization** ڕێپێدان، دەسەڵاتپێدان

**authorized user** بەکارهێنەری ڕێپێدراو، بەکارهێنەری دەسەڵاتپێدراو

**auto-** ١ـ "خۆ"، "خۆکار" ٢ـ "کۆمپیوتەری"، "ماشینی" (پێشگر)

**auto abstract** پوختەی کۆمپیوتەری (لە زانیاریگەیاندندا، پوختەدەقێ کە بە یارمەتیی کۆمپیوتەر ئامادە کرابێ)

**auto-answer** خۆوەڵام

**auto-boot** خۆبووت، خۆوەکارخەر

**autocode** ١ـ خۆڕەمز ٢ـ بەرنامەی خۆکار ٣ـ بەرنامەی چێکردنی کۆمپیوتەری

**autocorrect** ڕاستکردنەوەی خۆکار

**autodial**[1] (= auto-dial) ١ـ ژمارەگری خۆکار ٢ـ ژمارە لێدانی خۆکار

**autodial**[2] (= auto-dial) خۆژمارەگر (لە مۆدێم و تەلەفۆندا)

**auto-dialer** (= auto-dial = autodial) خۆژمارەگر

**autodial modem** مۆدێمی خۆژمارەگر

**AUTOEXEC.BAT** ئاوتۆـ ئێگزێک بەت (لە "DOS"دا، ناوی "پەڕگەی دەستەیی"ی خۆجێبەجێکەر، کە فرمانەکانی ناوی لە سەرەتای کاری کۆمپیوتەردا، خێرا پاش "بووت"بوونەوەی سیستەم جێبەجێ دەبن)

**autofocus** ئاوتۆفوکوس، خۆمیقاتساز

**autograph[1]** واژۆ

**autograph[2]** (= manuscript) دەستنووس

**autograph[3]** (= dynamic mathematics software) ئاوتۆگراف

(نەرمەواڵەی بیرکاریی بزۆزە کە بۆ فێرکردنی ژمارەکاری، تانوپۆی ئەندازەیی، سەرژمێری و شیمانە "احتمالات" بەکار دەچێت)

**autoidentifier** خۆناسکار

**automate** ١ـ خۆبەکاربەرین، بە خۆکارکردن

٢ـ کۆمپیوتەریکردن، ماشینیکردن

**automatic** خۆکار، ئۆتۆماتیک

**automation** خۆکاری

**autoplay** خۆلێدان، خۆگەڕ

**auto-repeat** خۆبارە، خۆپاتە

**auto-stop** خۆوەست، خۆوەستان

**autorestart** خۆدەستپێکردنەوە

**autoresponder** خۆوەڵامدەر

**autorun** خۆگەڕی

**autosave** خۆپاشەکەوت

**auto scan** پشکنینی خۆکار

**AutoShapes** شێوەخۆکارییەکان

**autotrack** سۆراخکردنی خۆکار (سەبارەت بە شوێنی مانگی دەستکرد)

**avatar** "ئاڤاتار" ، (ئەم وشەیە لە بنەڕەتدا لە زمانی "سەنسکریت"ەوە هاتووە، وە لەم سەردەمە نوێیەدا ئەم واتایانەی هەیە: ١ـ نوێنەرایەتییەکی ئەلەکترۆنی یان وێنەیی بۆ کەسێک یان دەورگێڕێک لە "Science fiction" و زانستی کۆمپیوتەردا. ٢ـ لە (مەکۆ forum) و شوێنی وا، بە وێنەیەک یان وێنۆچکەیەک دەوترێ کە نوێنەرایەتیی کەسێک یان

ئەندامێک یان بەشداربوویەک دەکات.

**AVI** (=Audio-Video Interleave file)

**AVS** (= antivirus software)

**axis** تەوەرە، تەوەر

# B, b

**B**[1] نیشانەی کورتەی "بایت"

**B**[2] "بی" (ناوی زمانێکی بەرنامەداڕێژیی ئاستبەرز)

**B:** بجووتخاڵ، بێ-جووتخاڵ (لە کۆمپیوتەرە کەسییەکاندا نیشانەی دیسکی نەرمی B)

**back** [1] ١ـ پشت، پاش، دوا ٢ـ ڕابردوو (ئاوەڵناو) ٣ـ پاڵپشتیکردن

**back** [2] گەڕانەوە، بۆ دواوە، بۆ پاشەوە
(ناو، فرمان. لە "GUI" و ئینتەرنێتدا، ڕۆیشتن بۆ "پەڕە" یان "سەرووپەڕە"ی پێشوو، کە پێشووتر هاتبووە سەر پەردەپیشانەکەدا. بەرانبەرەکەی "forward"ە)

**backbone** گازەرا، بڕبڕە (کۆمەڵێک لە گرێ بنەماییەکانی ڕایەڵە، کە لەلایەن هێڵەبەتواناکانەوە پێکەوە بەستراون)

**backbone network** ڕایەڵەی بڕبڕە (بەشێک لە ڕایەڵەیەکی "WAN" کە هەندێ ڕایەڵەی "LAN" بەهۆی "پرد"ەوە بە یەکتر دەبەستێتەوە)

**backdoor** پشتەدەرگا

**backdrop** (= background plane) پەردەی پاشبنەما

**backfile** (= backup file) پەڕگەی پاڵپشتی

**background** پاشبنەما

**backing** ١ـ پاڵپشتی ٢ـ پشتیوانی

**backslash (\)** لارەهێڵی پێچەوانە

**backspace (key)** کلیلی دوابەر، کلیلی بەرەودوا

**backup** پاڵپشت ـ پاراستن

**bad sector** کەرتی خراپ، سەکتەری خراپ

**badge reader** نیشانەخوێن، نیشانەخوێنەر (ناو. ئامێری چوونەژوورەوە، کە دەتوانێ ئەو زانیارییانەی کە لە کارتێکی بچووکی لاستیکیدا نهێنبەندی کراون، بخوێنێتەوە)

**balance** ١ـ هاوسەنگی، هاوتایی ٢ـ تەرازوو ٣ـ هاوسەنگکردن، هاوتاکردن، هاوتەرازکردن

**balanced** هاوسەنگ، هاوتا، هاوتەراز

**balanced bridge** پردی هاوسەنگ

**balanced error** هەڵەی هاوسەنگ (خاوەنی شیمانە "احتمال"ی هاوسەنگ و یەکسان)

**ball** گۆ، خڕ

**ball printer** چاپکەری گۆدار

**ban** ڕێگرتن

**band** باند، نەوار، شریت

**bandwidth** باندبەرینی

**banner[1]** بەیداخ

**banner[2]** سەردێڕی سەرەکی (بۆ وێنە گەورەترین سەردێڕی لاپەڕەی یەکەمی ڕۆژنامە)

**banner[3]** سەردێڕسازی (شێوەپێدان بە سەردێڕ)

**Banner[4]** بەنێر (ناوی بازرگانی. جۆرە نەرمەواڵەیەکی تایبەت بە دەسکاری و ئامادەکاریی سەردێڕ)

**banner[5]** بەنێر (لە ئینتەرنێتدا، هەرجۆرە ڕاگەیاندنامەیەک بەشێوەی لاکێشە لە پەڕەی وێبدا)

**bar** تووڵ، شیش، میلە

**barcode** تووڵکۆد

**base** بنچینە

**basic**[1] بنچینەیی، بنچینە

**BASIC**[2] (= Basic = Beginners Symbolic All-purpose Instruction Code)
بەیسیک (ڕەمزی فەرماننامەییی هێمایانەی هەموومەبەستەی دەستپێکەران)

**basic code**[1] کۆدی بنچینەیی، هێمای بنچینەیی

**BASIC code**[2] بەرنامەی بەیسیک

**BASIC compiler** وەرگێڕی بەیسیک

**basic ditionary** وشەنامەی بنەما، وشەنامەی بنچینەیی

**basic shapes** شێوەبنەماییەکان

**batch** ١ـ دەستە، پۆل، چەپک ٢ـ دەستەیی، پۆلی، چەپکی ٣ـ دەستەکردن، دەستەییکردن، بەپۆلکردن، بەچەپککردن (دانانی کۆمەڵێ فرمان یان کارێ، لە نۆرەی جێبەجێبووندا، یان دروستکردنی پەڕگەی دەستەیی)

**batch file** پەڕگەی دەستەیی (پەڕگەیەک کە یەک یان چەند فرمانێکی تێدایە، بەدوای یەکدا جێبەجێ دەبن)

**benchmark** هەڵسەنگێنەر

**beta** بێتا

**binary** دوویی، دوانی

**BIOS** (= basic input/output operating system) "بایۆس"، "بی ئای ئۆ ئێس" (سیستەمی کارپێکردنی تێچوو/ دەرچووی سەرەکی)

**bit** بیت

**blank** بەتاڵ، سپی

**block** ١ـ بەربەست ٢ـ بلۆک

**blog** بلۆگ

**blogger** بلۆگنووس

**Bluetooth** بلووتووس، ددانشین

(پێوانەییەکی ئاڵوگۆڕکردنی دراوەیە. بوارێکی ڕەخساو بۆ هەمە چەشن دەزگای ئەلیکترۆنی ساز دەکات، کە دراوەا و زانیاریی (بە هەموو جۆرەکانی دەق، ڕەنگ، دەنگ..هتد) تاوتوێ پێ بکەن. بێتەل لە نیوان ١٠ تاکوو ١٠٠ مەتردا کار دەکات. ئەم تەکنیکە کۆمپانیای ئەریکسۆن دایهێنا و بەناوی پاشایەکی دانیمارکی ناوی لێ نراوە، کە هەمیشە لەبەر تووترِک خواردن ددانەکانی ڕەنگیان شین بووە)

**bookmark**[1] (= book mark = place marker) پەڕتووکنیشانەکەر، جێنیشانەکەر، جێدۆز (ئەو چێوەی کە دەخرێتە نێوان کتێبێ بۆ ئەوەی شوێنی خوێندنەکە بۆ جارێکی تر دیاری بکرێت)

**bookmark**[2] پەڕتووکنیشانەکەر، نیشانەکەری نێوان کتێب، نیشانەکەری شوێن یان وێبگە، شوێندۆزی وێبگە، وێبگەنیشانەکەر (لە ئینتەرنێتدا، هێمایەک کە لە کاتی کارکردن لە وێبگەیەکدا لە "تووڵامراز toolbar"ی وێبگەڕەکە دای دەنێن تا ناونیشانی ئەو وێبگەیە وەکوو ~ێ لە وێبگەڕەکەدا تۆمار کرێت. بەم جۆرە لە کاتی داهاتووی وێبگەردیدا، بێ ئەوەی پێویست بکات ناونیشانی وێبگەکە بنووسرێتەوە، تەنها بە جێگیرکردنی ناوی وێبگەکە لە منووی ~ەکە، سیستەمەکە دەچێتە ناو وێبگەکەوە)

**boolean**[1] (= logical = Boolean) بوولی

**Boolean**[2] (= Boolean) کەمایەتیی بوولی، گۆڕاوی بوولی

**boolean algebra** جەبری بوولی

**boot** "بووت"، خستنەڕێ (خستنەڕێی سیستەمی کارپێکردن لە سەرەتاوە)

**bounce**[1] دەرکردن

**bounce**[2] گەڕانەوە (لە ئینتەرنێتدا، گەڕانەوەی نامە یان پەیامی نێردراو لەبەر ئەوەی کە ناونیشانەکە هەڵەیە یان کێشەیەکی کۆمپیوتەری لە ئارادایە)

**box** باوڵ، سندوق، جێدان

**BRB** (= be right back) "هـەر ئێستـە دێـمـەوە"، (ئـەم سـەروشـەیـە زۆر جار لـە مـەکۆکـانـدا بـەکار دەچێت و لـە جیاتیـی ئـەوەی بنووسرێ ( be right back) کـە بـە کوردی دەبێتـە (هـەر ئێستـە دێمـەوە)، بـەس سـەروشـە ئینگلیزییـەکـە دەنووسرێت: (BRB)

**broadband** بـەرینبـانـد

**broadcast** بڵاوکردنـەوە، پـەخش، وەشـان

**browser** گـەڕۆک، ئینتـەرنێتخوێنـەر (پرۆگرامی خوێندنـەوەی لاپـەڕەکـانـی ئینتـەرنێت)

**budget** بوودجـە

**buffer** نێوانگر، بیرگـەی نێوانگر (هـەموو جۆرە بیرگـەیـەکی کـاتیـی ناوبـەستی نێوان دوو بیرگـە یان خولگـە یان سیستـەم)

**bug** کـەلێن، چـەوتـی، هـەڵـە

**build** ١ـ پێکهێـنـان ٢ـ بـەرزکردنـەوە

**burner** سووتێنـەر

**burst** ١ـ تـەقینـەوە ٢ـ تـەقـانـدنـەوە

**bus** تێپـەڕگـە

**busy** سـەرقـاڵ

**busy hour** کـاژێری سـەرقـاڵـی

**button** دوگمـە

**bypass** لاتێپـەڕی، بـەلاداتێپـەڕین

**byte** بـایت، هـەشتـە، هـەشت بیت، ٨ بیت

# C, c

**C**[1] "سی" (ناوی زمانێکی بەرنامەداڕێژیی ئاستبەرز)

**C**[2] "سی"، (ڕەنووسی شانزە شانزەیی، بەرانبەر بە ١٢ دەدەیی)

**C#** "سیشارپ" (ناوی زمانێکی بەرنامەداڕێژیی ئاستبەرز)

**C+** "سی+"، "سیپڵەس"، (ناوی بەرنامەیەکی بەرنامەسازیی ئاستبەرزە کە سەرووتر لە "C"ە)

**C++** "سی++"، "سیپڵەسپڵەس"، (ناوی زمانێکی بەرنامەداڕێژیی ئاستبەرز)

**C:** سجووتخاڵ، سی-جووتخاڵ (لە کۆمپیوتەرە کەسییەکاندا نیشانەی دیسکی ڕەقی C)

**cab**[1] درێژکراوەیە بۆ پەڕگەیەکی پەستێنراوە سیستەمەکانی ویندۆزدا. کورتراوەی cabinet

**cab**[2] ژووریلە

**cable** کێبڵ

**cache** حەشارگە

**CAD** (= computer-aided design**)** داڕشتن بە یارمەتیی کۆمپیۆتەر

**caddy** "کەدی" قەباغی سیدی (قەباغی تایبەتی هەڵگرتنی دیسکی سیدی)

**calculate** ١ـ ژماردن، هەژمارکردن ٢ـ لێکدانەوە ٣ـ نەخشەدانان، ڕێکخستن

**calculation** ژمێرکاری، ژماردن، هەژمارکردن

**calculator** ژمێرەر، ئامێری ژماردن

**cancel** هەڵوەشاندنەوە

**canonical** بەپێی یاسا

**capability** توانا، توانست، توانایی

**capacity** ١ـ جێگرتن، فراوانی ٢ـ توانست

**capture** گرتن

**card** کارت

**case** سنووق (ی کاڵاڕەقەکانی کۆمپیوتەر)

**case (SW)** بار، دۆخ

**category** هاوپۆلەکان

**CD-ROM** (= compact-disc read-only memory = compact-disc ROM)
"سیدی‌ـ رام"، دیسکی تیشکی (بیرگەی تەنها خوێنەریی دیسکی پەستاوتە. جۆرە بیرگەیەکی دەرەکیی کۆمپیوتەر، بەشێوەی دیسک بە تەکنۆلۆژیای تیشکی یان لیزەری)

**CD-RW** (= compact disc, rewriteable) (CD-RW)، دیسکی پەستێنراوی لەسەرنووسەنی (فۆرماتێکی دیسکی پەستێنراو (CD)ە کە ڕێگە دەدات بەردەوام تۆمار لەسەر دیسکێ بکرێت)

**central** ناوەندی

**certificate** بڕوانامە

**CGI**[1] = Common Gateway Interface

**CGI**[2] = Computer Graphics Interface

**challenge/response** بەرەنگاری/ وەڵام (لە پاراستنی دراوەکاندا)

**CHAP** (= Challenge-Handshake Authentication Protocol) CHAP
سیئێچئەیپی (شێوەیەکی پارێزراوە بۆ پێوەندبوون بە سیستەمێک. کۆنووسێکی پاراستنە بۆ پێوەندییە لێکبەستراوەکان کە تیایدا بەرپێوەبەر خۆی دەتوانێ بڕیاردەر بێ کە چەندە "چوونەژوورەوە" و "تێپەڕوشە" پێویستە)

**char** = character

| | |
|---|---|
| **character** | نووسە، هێما |
| **charge** | بارگە |
| **charged** | بارگەکراو، بارگاوی |
| **charger** | بارگاویکەر، بارگەدەر |
| **chart** | هێڵکاری |
| **chat** | دەمەتەقێ، چات |
| **check** | پیاچوونەوە، تێڕوانین |
| **check box** | چوارگۆشەی پیاچوونەوە، خانەی پیاچوونەوە |
| **chip** | چیپ، تەڵەزم، تەڵاش |
| **chip set** | کۆمەڵە تەڵەزم (کۆمەڵە مۆنتاژبوویەکی چەند تەڵەزم کە کارێکی دیاریکراو جێبەجێ دەکات) |
| **cipher** | سفر، سفراندن |
| **circuit** | خولگە، کەمەرە، چێوە |
| **class** | پۆل |
| **click** | کرتە، کلیک |
| **client** | ڕاژەخواز |
| **clip** | گرتە، کلیپ، چەپک |
| **clock rate** (= clock speed) | تێکڕای لەرە، چرکەلەرە، ڕێژەی لەرە (= خێرایی کاتژمێر) |
| **clone** | لەبەرگرتنەوە، وەکخۆی، کلۆن، کتومت (کۆمپیوتەرێ کە (لەلایەن دروستکەرێکەوە چێ دەکرێ و پێکهاتەکەی کتومت لەگەڵ پێکهاتەی کۆمپیوتەرێکی چێکراوی دروستکەرێکی ترەوە وەک یەکە) |
| **close**[1] | داخستن (دەستوور یان فەرمانی داخستن و کۆتاییپێهێنان بە کاری پەڕگە) |
| **close**[2] | نزیک (ئاوەڵناو) |
| **close and open a file** | کردنەوە و داخستنی پەڕگە |
| **close button** (= X button) | دوگمەی داخستن |

**closed** داخراو (ئاوەڵناو)

**cloud computing** ژمێرکاریی هەور، هەورەژمێرکاری

**cloud operating system** هەورەسیستەمی کارگێڕی (وەکوو ویندۆزی ئازور azure)

**cluster** هێشوو، چەپک، گرووپ

**CMOS** (= complementary metal-oxide semiconductor) (CMOS)، "سیمۆس" (نیمچەگەیەنەری ئۆکسیدی کانزای تەواوکەر. جۆرە ئامێرێکی ئەلەکترۆنی)

**code[1]** کۆد، ڕەمز، نهێنی

**code[2]** (= program) ١ـ بەرنامە (زاراوەی کۆن بەرانبەر بە وشەی "program" کە تاڕادەیەک لەکار کەوتووە، بەڵام لە هەندێ لە زاراوە پێکهاتەیییەکاندا هێشتا هەر بەکارهێنانی هەیە) ٢ـ بەرنامەنووسی

**code[3]** نهێنبەندیکردن

**code[4]** = encode

**codec** (codec)، ڕەمزدانان، "کۆدێک" (لە پێوەندییە دراوەیییەکاندا، ئامێرێک بۆ نهێنیبەندیی هێما بەراوردییەکان و گۆڕانیان بە ڕەنووسی و، گەڕانەوەیان بۆ شێوە بەراوردییە سەرەتایییەکان)

**collapse** ١ـ ڕووخان، ڕمان، هەرەسهێنان ٢ـ نووشتانەوە ٣ـ کەوتن

**column** ستوون

**COM[1]** (= Component Object Model) COM، بەردی بیناسازیی مایکرۆسۆفت لە "کۆنترۆڵەکان controls" لە "ئەکتیڤئێکس Active X"دا

**COM[2]** (= Computer Output on Microfilm) COM، دەرۆچکەی کۆمپیوتەر لە مایکرۆفیلمدا

**COM**[3] COM، کام (لە ئینتەرنێتدا، یەکێک لە درێژکراوەکانی ناوەدۆمەین "ناونیشانی وێب"ە، بۆ وێنە لە yahoo.com، کە بۆ وێبگە بازرگانییەکان commercial بەکار دەچێت)

**COM**[4] [executable program] کام (لە DOSدا، جۆرە درێژکراوەیەکی پەڕگەی جێبەجێکاریی دوودووییە binary)

**combine** تێکەڵکردن، یەکگرتن، ئاوێتەکردن

**comma** بۆر، کۆما، وێرگول

**command** فەرمان

**comment** ١ ـ ڕوونکردنەوە ٢ـ بۆچوون، لێدوان، تێبینی، سەرنج

**common** هاوبەش، باو

**Common Gateway Interface** (= CGI) ناوبەستی دەرەڕێی هاوبەش (لە ئینتەرنێتدا، شێوەناسی، ناوبەست، وە یا بەرنامەیەک کە دەتوانێ لەگەڵ کۆمپیوتەری ڕاژەکار پێوەندیی چالاک پێک بهێنێ)

**communication** ١ـ ڕاگەیاندن، پێگەیاندن ٢ـ پێوەندی ٣ـ هۆی گەیاندن یا پێوەندیگرتن

**compact** پەستێنراو

**company** بەشگە، هاوبەشگە

**compatible** گونجاو، شیاو

**compile** وەرگێڕان، کۆکردنەوە، لەسەریەک دانان

**compiler** وەرگێڕ، کۆکەرەوە

**compress** ١ـ پەستان ٢ـ پەستن، پەستانەوە، گردکردنەوە

**computable** ژماردنی، دەتوانێ بژمێردرێت، ژماردەنی

**computation** ١ـ ژماردن، لێکدانەوە ٢ـ ئەنجامی ژماردنێک

**compute**[1] ژماردن، لێکدانەوە

**compute²** پێژمێری، پێژمێرکردن (هەر جۆرە ژمارەگەرییەک کە پێویستی بە بەکارهێنانی پێژمێر "کۆمپیوتەر" بێت)

**computer** کۆمپیوتەر، ژمێرەک، بژمێر، پێژمێر، ژمێرەری ئەلیکترۆنی

**computer abuse** خراپ بەکارهێنانی کۆمپیوتەر

**computer-aided** (= CA = computer assisted)
کۆمپیوتەریاریدەدەر، پێژمێریاریدەدەر

**computer animation** بەجووڵەگەریی کۆمپیوتەری (کەڵکوەرگرتن لە پێژمێر بۆ چێکردنی کارتۆن)

**Computer Graphics Interface** (= CGI) ناوبەستی گرافیکی پێژمێر، ناوبەستی گرافیکی کۆمپیوتەر

**CON** (CON)، "کون"، (ناو. لە "DOS"دا، ناوی ژێربێژیی ئامێری کونسول، کە بە تەختەکلیل و پەردەپیشان دەوترێ)

**concat** کۆکردنەوە، خستنەسەریەک

**conditional formatting** شێوازکاریی بەمەرج، فۆرماتکردنی بەمەرج

**configuration** شێوەپێدان

**connection** بەستنەوە، پەیوەندی

**conslole** شێلمان، هەڵگر، تاق، سەردیوار

**console** = CON

**constant** نەگۆڕ، چەسپاو

**constructor** بنیاتنەر، دارێژەر

**content** ناوەڕۆک

**content layout** گەڵاڵەبەندیی ناوەڕۆک

**context** ١ـ دەق ٢ـ پێکهات، تەنراو، شانە

**context menu** لیستەی پێکهات

**continue** درێژەپێدان، بەردەوامبوون

**control bus** تێپەڕگەی ڕێکخستن، تێپەڕگەی کۆنترۆڵ

**control panel** پەڕەی چاودێری

**controls** کۆنترۆڵەکان، ڕۆتینەکانی پرۆگرام لە "ئەکتیڤئێکس"دا، بەنزیکە وەک "جاڤا"یە لە "ئەپل"دا

**convert** گۆڕین، گۆڕان

**cookie** (= Cookie) شەکرۆکە (لە ئینتەرنێتدا، جۆرە دەقەپەڕگەیەکی بچکۆلەیە، کە بەهۆی نەرمەواڵەی "گەڕۆک browser"ەوە، لەسەر بنەمای زانیارییەکانی وێبگەیەک چێ دەکرێت و لەبەرگرەوەی زانیارییە سەرنجڕاکێشەکانی بەکارهێنەرە)

**copy** ڕوونووس، لەبەرگرتنەوە

**copyright** مافی لەبەرگرتنەوە

**cost** تێچوون، بەها

**count** ١ـ ژماردن ٢ـ کۆکردنەوە

**counter** ژمێرەر

**CPRM** (= Content Protection for Removable Media)
سیپیئارئێم، پاراستنی ناوەڕۆکی ڕاگەیێنە لابردەنییەکان (تەکنۆلۆژیایەکی داڕێژراو لەسەر بنەمای ڕەقەواڵەیە بۆ جێبەجێکردنی سنووردارییەکانی پاراستنی لەبەرگرتنەوە)

**CPU** (= central processing unit) سیپییوو (یەکەی ڕێکخەری ناوەندی، ڕێکخەری ناوەندی)

**crack** شکان، کراک

**CRAM** (= challenge-response authentication mechanism)
CRAM، سیئارئەیئێم ("گەلالەوارە scheme"یەکی دووئاستەیە بۆ ڕێپێدانی بەکارهێنەرانی ڕایەڵە کە وەکوو بەشێک لە "کۆنووسی گواستنەوەی سەروودەق Hypertext Transfer Protocol = HTTP"ی وێب بەکار دەبرێت)

**crash** تێکشکان

**crawler** وێبخشۆک

**create** ئافراندن، دروستکردن

**credit** بایەخ، بڕوا

**credit card** بڕواکارت، کارتی بڕوا، کارتی بایەخ، کارتی قەرز

**cron** کارگێڕ

**crossover**[1] پەڕینەوە، بڕین

**crossover**[2] بڕگا، شوێنی یەکتربڕین

**cryptography** نهێنیکردن

**CSMA-CD** (= carrier sense multiple access/collision detection) سزماسیدی، دەستپێگەیشتنی چەندجارەی وەرگری هەڵگر/ ئاشکراسازیی پێکدادان (جۆرە پرۆتۆکۆلێکی ڕایەڵە)

**CSS** (= cascading style sheet) سیئێسئێس (کۆمەڵە ڕێسایەکە بۆ ئەوەی کە چۆن بەڵگەنامەیەکی (HTML) شێوەی پێ بدرێت یان بەسانایی بڵێین شێوازەزمانێکە)

**CSV**[1] (= comma-separated value) (CSV)، سیئێسڤی، بەهای بە بۆر جیابوو (لە پێکهاتە دراوەییەکاندا، ئەو تۆمارەی کە بوارەکانی بە بۆر لێک جیا بوونەتەوە)

**CSV**[2] [comma delimited] (جۆرە درێژکراوەیەکی پەڕگە)

**ctrl-key** دوگمەی کۆنترۆڵ، دوگمەـ کونترۆڵ

**currency** دراو، پارە

**current**[1] (= electric current) تەزوو، لووزەو (تەزووی کارەبایی)

**current**[2] تایبەتی بە ئێستا، دواژمارە (گۆڤار، ڕۆژنامە، کتێب، دواوەشانی کتێبێک)

**current**[3] هەنووکەیی، ئێستەیی، هی ئێستە، دوایین

**current address** دوایین ناونیشان

**current date** ڕێکەوتی ئێستاکە

**cursor** جێنیشاندەر

**custom** ڕاسپێراو

**customize** کڕیارخوازکردن، گونجان، سازدان (چاکردن و گۆڕینی شتێک بەپێی خواستی کڕیار)

**cut** بڕین

**CVS** (= Concurrent Versions System) سیڤیئێس، سیستەمی وەشانە هاوکاتەکان (سیستەمێکە بۆ هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ وەشانەکان. سیستەمەکە ئاگاداری گۆڕانکارییەکانی ناو پەڕگە جۆربەجۆرەکانی پڕۆژەیەکە. بە یارمەتیی ئەمە مرۆڤ دەتوانێ ئاگاداری دوایین وەشانەکانی پەڕگەیەک بێ کە کۆمەڵێ بەکارهێنەر کاری لەگەڵدا دەکەن، هەروەها بەسانایی دەتوانرێ بگەڕێتەوە بۆ وەشانی پێشوو)

**CWIS** (= Campus Wide Information System) سیستەمی بەرفراوانی کۆگاکردنی زانیارییەکانە لە زانکۆ و پەیمانگاکاندا

**cybrarian** کارمەندی کتێبخانەی دیجیتاڵ (کتێبەوانێک کە کار لەسەر کتێبخانەی ئەلیکترۆنی بکات)

# D, d

**D**[1] "دی" (ناوی زمانێکی بەرنامەداڕێژیی ئاستبەرز. زۆر لە یەکچووی C و ++C دەچێ و ساڵی ١٩٩٩ پەرەی پێ دراوە)

**D**[2] "دی"، (ڕەنووسی شانزەشانزەیی، بەرانبەر ١٣ دەدەیی)

**D:** "دیجووتخاڵ"، (لە کۆمپیوتەرە کەسییەکاندا نیشانەی ڕەقەدیسکی D)

**DAD** = digital audio disk دیسکی بیستنی ژمارەیی

**daemon** = demon

**dash** کشتەک، تەقەڵ (تێبینی: جیاوازی هەیە لەنێوان کورتەهێڵی [کشتەک dash] و کورتەهێڵی [بەستهێڵ، کورتەتەقەڵ hyphen]. "کشتەک" - کە لە کوردیدا بە واتای دەزووی بادراوە ـ و بەرانبەر بە "dash" دانراوە، درێژییەکەی دوو ئەوەندەی [بەستهێڵ، کورتەتەقەڵ hyphen]ە، "بەستهێڵ" واتە هێڵێ کە دوو وشە بە یەکەوە دەبەستێتەوە، کە لە زمانە ئینگلیزییەکاندا باوە، بۆ وێنە: "-CD ROM").

**DAT**[1] [Data] (DAT)، دات (درێژکراوە و نیشانەی دراوەپەڕگە، وەکوو پەڕگەی دەق لە "DOS"دا و، پەڕگەی دەنگی ـ وێنەیی لە "ڕاگەیێنەکان media"دا)

**DAT**[2] = digital audio tape

**DAT**[3] = dynamic address translation

**data** دراوە، زانیاری

**data bus** تێپەڕگەی دراوە

**data warehouse** کۆگای دراوە

**database** بنکەدراوە، بنکەی دراوە

**datagram** داتاگرام

**date** ڕێکەوت، بەروار

**debug[1]** ڕاستکردنەوە، هەڵەدۆزین، هەڵەسڕینەوە (لابردن و سڕینەوەی هەڵە لە بەرنامە و پەڕگە)

**debug[2]** سیخوڕسڕی، سیخوڕسڕینەوە (دۆزینەوە و هەڵوەشاندنەوەی سیخوڕە ئەلەکتریکییەکانی وەک مایکرۆفۆنی شاراوە)

**debugger** هەڵەدۆز، ڕاستکەرەوە، هەڵەسڕ

**decode** کۆدهەڵوەشاندنەوە

**decoder** کۆدهەڵوەشێنەر

**decompile** وەرگێڕاندنەوە

**decompiler** وەرگێڕێنەر

**decompress** شیتەڵکردنەوە

**decryption** ئاشکراکردن

**dedicated** تایبەتمەند

**default** بنەڕەت

**defragment** دێفراگمێنت، یەکخستنی پارچەبەندبووەکان، ڕێکخستن و خستنەپاڵیەکی هەڵگیراوەکانی ناو پەپکە (لە سیستەمی کارپێکردندا، بەتایبەت لە "Dos"دا و، بە شێوەیەکی گشتی لە بەڕێوەبەرایەتیی بیرگەدا، گواستنەوەی پارچە پرشبووەکانی پەڕگە لە کەرت (سەکتەر)ە پرشوبڵاوبووەکان بە یەک یان چەند سکتووری تەنیشتی یەکترەوە)

**delete** سڕینەوە

**demilitarized zone** (= DMZ) DMZ، ناوچەی سوپالێدەرکراو، ناوچەی بێسوپا، ناوچەی سوپالێکێشراو (لە ڕایەڵەکانی کۆمپیوتەردا، کۆمپیوتەرێکی خانەخوێ یان ڕایەڵەیەکی بچکۆلەی تێخراوە کە وەکوو "ناوچەیەکی بێلایەن"ە لەنێوان ڕایەڵەیەکی خۆییی کۆمپانیایەک و ڕایەڵەیەکی هەمووانیی دەرەوە)

**demo** پیشاندان

**demon**[1] (= daemon) (demon)، دێمۆن، دیمن، تارمایی، شەوە (لە سیستەمی کارپێکردندا بۆ وێنە لە یونیکس، بەرنامە یان ڕەوتێ کە لە بەرچاوی بەکارهێنەر شاراوەیە و تەنیا لە کاتی پێویستدا، بەشێوەی خۆکار، بار دەبێ و هەندێ لە کارە سیستەمییەکان و هی تر جێبەجێ دەکا و دوایی دیسانەوە خۆی حەشار دەداتەوە)

**demon**[2] (= daemon) (demon)، دێمۆن، قوفڵشکێن (لە پاراستنی دراوەکاندا، بەرنامەیەک کە بۆ شکان یا کردنەوەی هەندێ لە گەڵاڵەوێنەکانی پاراستنی نەرمەواڵە بەکار دەبرێت)

**dencity** چڕی

**denial** نکۆڵی

**depth** قووڵایی

**depth-first search** (= DFS) گەڕانی لەپێشدالەقووڵایی

**derived** داتاشراو

**descend** نزمبوونەوە، هاتنەخوارەوە

**descendant** نەوە، وچە، بەرە، توخم

**descender** خوارهاتوو، شۆڕبوو، (ناو. لە پیتچنیدا، پیتێ کە بەشێکی بەرەو خوارەوەی بەشی سەرەکی یان ناوەندیی پیتەکە شۆڕ بووبێتەوە، وەکوو p، g و q، کە لەوانەدا هێڵێکی بچووک لە چەقی پیتەکەوە بەرەو خوارەوە درێژەی هەیە)

**descending** داشۆڕی، داکشاوی، نزمبوونی، هاتنەخواری (ئاوەڵناو)

**description** نیشانەهەڵدان، وەسفکردەن، وەسف

**design** داڕشتن

**desire** داخوازی، خواست

**desktop** ڕوومێز

**desktop computer** کۆمپیۆتەری ڕوومێز

**destructor** لەناوبەر

**detail** وردی، وردکاری

**device** ئامێر

**device driver** ئامێروەگەڕخەر

**DFS** = depth-first search

**DHCP** (= Dynamic Host Configuration Protocol) (DHCP)،
پرۆتۆکۆلی ڕێکخستنی خانەخوێی بزۆک (پرۆتۆکۆلێکی ڕایەڵەیە
کە ئەگەری ئەوە دەدات زانیاریی ڕایەڵە بدرێتە کۆمپیوتەرەکانی
تۆڕێکی هاوبەش و ناونیشانی ئایپی بداتە کۆمپیوتەرەکان بە شێوەیەکی
بزۆک)

**DHTML** (= Dynamic Hypertext Markup Language) (DHTML)،
زمانی هێمادانانی سەروودەقی بزۆک

**diagram** پێنوێن، خشتە، نوانە

**dial** ١ـ ژمارەگر ٢ـ ژمارەگرتن

**dial-up** ١ـ ژمارەگری ٢ـ ژمارەگریکردن

**digit** ڕەنووس

**digital** دیجیتاڵ، ڕەنووسی

**digital audio disk** (= DAD) دیسکی دەنگی ڕەنووسی، سیدیی
دەنگی

**digital audio tape** (= DAT) شریتی دەنگی ڕەنووسی،
"دات" (جۆرە کاسێتێکی دەنگی بۆ تۆمار و بڵاوکردنەوەی دەنگ بە شێوەی
"نهێنیبەندیی ڕەنووسی")

**digital technique** تەکنیکی ژمارەیی

**dimension** ١ـ دووری، لا (پانی و درێژی و ئەستووری) ٢ـ لاکان ٣ـ
ڕادە ٤ـ مەودا، گرنگی، رەهەند

**direct** ڕاستەوخۆ

**directory** پێڕست

**DirectX** (DirectX)، دایرێکتئێکس (لە ویندۆزدا، جۆرە

نەرمەواڵەیەکی سیستەمیی ناوبەستی بەرنامەدارێژی، تایبەت بە بەدیهێنانی پێوەندی لەنێوان بەرنامەکانی بەکارهێنەری، سیستەمی کارپێکردن و، ڕەقەواڵەی کۆمپیوتەر)

**disable** ١ـ لەکارخستن ٢ـ نەتوانکردن

**disk** پەپکە، دیسک

**disk drive** (= drive = disk unit = DD) دیسکلێخوڕ، دیسکوەگەڕخەر، پەپکەلێخوڕ، پەپکەوەگەڕخەر

**display** پیشاندان

**Disruptive technology** تەکنۆلۆژیای تێکدەر

**distribution** دابەشکردن

**DLL** (= Dynamic Link Library) پەرتووکخانەی بەستەری بزۆک

**document** بەڵگەنامە

**domain** دۆمەین، پاوان، قەڵەمڕەو

**domain name** ناوی دۆمەین، ناوی پاوان

**DNS[1]** (= Domain Name Service) ڕاژەی ناوی پاوان (بنواڕە DNS[3])

**DNS[2]** (= Domain Name Server) ڕاژەکاری ناوی پاوان (بنواڕە DNS[3])

**DNS[3]** (= **D**omain **N**ame **S**ystem) سیستەمی ناوی پاوان (ناوی پاوان یان "ناوی دۆمەین Domain Name" بەگوێرەی ڕیزبوونی ئەلفبێ دەنووسرێ بۆ ئەوەی باشتر بکەوێتەوە بیری ئێمە وکوو: "www.google.com" بەڵام لەڕاستیدا ئینتەرنێت لەسەر بنەمای "ناونیشانی ئایپی IP adress" کە ژمارەییە دامەزراوە و بۆ تێگەیشتنی دەبێ ناوە ئەلفبێییەکان بگۆڕدرێتەوە سەر ناوی ژمارەیی "ئایپی IP". ئەمەش خزمەتگوزاری و ڕاژەیەکە کە "DNS" دەیکات، بۆ نموونە ناونیشانە ئەلفبێییەکەی گووگڵ وەردەگێڕێتە سەر ناونیشانی ئایپییەکەی کە بریتییە لە: "66.249.91.103")

**done** کراو، جێبەجێکراو

**dongle** کڵۆمی سەختەواڵە (لە پاراستنی دراوەکاندا، قفڵێکی بچووکە کە لە سەرەڕێی دەرۆچکەی هاوتەریبی چاپگەر یان دەرۆچکەی زنجیرە هەڵدەواسرێ)

**ping** (= Packet Internet Groper) — (ping)، پینگ (لە ئینتەرنێتدا بەرنامەی TCP/IP بۆ بایەخپێوانی پێوەندی)

**pixel** — وێنەخاڵ

**platform** — سەکۆ

**platform independence** — سەربەخۆیی لە سەکۆ (نەبوونی پێوەندایەتی بە سەکۆ)

**play** — لێدان، بەگەڕ خستن

**plot[1]** — ١ـ وێنە، نەخشە، نیگار، بیچم ٢ـ وێنەکێشان، نەخشکێشان، نیگارکێشان

**plot[2]** — تەرز، بیچم، دارِشتنی گشتی

**plotter** (= plotting board = digital plotter) — کێشەر، نەخشکێشەر، وێنەکێشەر، نیگارکێشەر، بیچمکێشەر، پلۆتەر (ئامێری دەرچوو، وەکوو "چاپگەر" کە کێشراوە ڕەنووسییە ڕێکخەریکراوەکان، بەشێوەی نەگۆڕێکی ئاسۆیی ـ ئەستوونی نیگارکێش دەکات)

**plug-and-play[1]** (= PnP) — پێوەکردن و لێدان، پێوەکردنولێدان، پێوەکردن-و-لێدان (سەبارەت بەو ئامێر و کەرەستانەی کە هەر پێوە کران دەکەونە بەکاربەرین)

**Plug and Play[2]** — (Plug and Play)، پلاگئەندپلەی، (ناوی بازرگانی. لە ویندۆزدا، تایبەتمەندییەک کە ئەگەری پێوەکردن و لابردنی خۆکاری ئامێرە دەرەکییەکان بە شێوەیەکی خۆکار پێک دەهێنێ)

**plug-in** — پێوەکردن، پێوەکراو

**PnP[1]** = plug-and-play

**PNP[2]** — "پیئێنپی" (لە پێوەند لەگەڵ ئامێرە نیمچەگەیەنەرەکانی پێکهاتوو لە سێ توێی P و N و P)

**point** — بۆر، خاڵ

**pointer** — نیشاندەر

**Point-to-Point Protocol** (= PPP) — پرۆتۆکۆلی

خاڵ-بە-خاڵ، پرۆتۆکۆلی خاڵبەخاڵ (لە ئینتەرنێتدا، یەکێک لە شێوەکانی پێوەندبوون بە ڕایەڵە)

**pop[1]** (pop)، "پاپ، پۆپ"، دەرپەڕاندن، لابردن

**pop[2]** دەرپەڕاندن، جێبەجێکردنی کردەی "پاپ"

**POP[3]** (= Post Office Protocol) پاپ (پرۆتۆکۆلی نووسینگەی پۆست. یەکێک لە شێوازەکانی کاری نەرمەواڵەکانی ئیمەیل)

**pop-up** پۆپئەپ، سەرهەڵدەر (لەپڕ سەرهەڵدەر)

**pop-up menu** منووی سەرهەڵدەر

**popular** ١ـ گشتی ٢ـ بەبرەو، بەباو، باو، ویستراو

**port[1]** دەرگا (لە گواستنەوەی دراوەکاندا، بەو شوێنە دەوترێ کە بتوانرێ وایەرە پێوەندییەکان پێوەند بدرێت بە سیستەمەوە، بۆ وێنە لە پشتی کۆمپیوتەر ئەو شوێنەی کە بتوانرێ کێبڵی چاپگەرەکەی پێوە پێوەند بدرێت)

**port[2]** دەرگا (لە ئینتەرنێتدا، ژمارەی خاڵی چوونەناو یان چوونەدەر، کە بەشێکە لە URL)

**port[3]** دەرگا (لە ڕایەڵەدا، دەزگایەک یان تۆڕێک لە هێڵەکان کە لەڕێی ئەوەوە، گواستنەوە، بینین و هەڵسەنگاندنی دراوەکان لواو دەبێت)

**port[4]** ڕاگواستن (گۆڕینی نەمەواڵەیەک بە نەرمەواڵەیەکی تر، بەمەبەستی بەکاربەریی لە سەکۆیەکی تردا، بۆ وێنە گۆڕینی بەرنامەیەکی ویندۆز بە بەرنامەیەک کە بکرێت لە "مەکینتاش"دا جێبەجێ بکرێت)

**port[5]** دەرگا، دەرگە، دەرکە (هەر جۆرە چوونەناوگە یان چوونەدەرگەیەکی ڕایەڵە)

**port[6]** زارک، دەم (لە بەرزەبێژدان "جەعبەبلیندگۆ"ی باس-ریفلێکس، کونێکە کە وەڵامی گشتیی سیستەمەکە چاک دەکاتەوە)

**portability** هەڵگرتەنێتی، توانای گواستنەوە یان هەڵگیران بۆهەبوون

**portable** هەلگرتەنی، هەڵگرتنی، هەڵدەگیرێ، دەستی

**portable computer** پێژمێری هەڵگرتەنی، کۆمپیوتەری هەڵگرتەنی

**positive (+)** ئەرێنی

**power** هێز، وزە

**power supply** سەرچاوەخۆراک، سەرچاوەخۆراکی ئەلەکترۆنیکی، سەرچاوەبژێو (ناو. کەرەستەی بەدیهێنانی تەزووی ئەلەکترۆنیکیی "دیسی")

**PPP** = Point-to-Point Protocol

**preference** هەڵبژاردە، بە چاک زانین

**prefixe** ١- پێشگر ٢- پێشبەند، پێشکۆ

**presentation** پێشکەشکاری

**preview** پێشبینین

**primary** سەرەتایی

**prime number** ژمارەی خۆبەش

**print** چاپ ـ دەرنووس، دەرنووسکردن

**Print Screen key** دوگمەی چاپکردنی پەردە (لەسەر تەختەکلیل هەیە بۆ ناردنی بینراوی سەر پەردە بۆ چاپکردن بەکار دەهێنرێت)

**printer** چاپکەر، چاپگەر، دەرنووسگەر

**priority** پێشەنگی

**privacy** خۆیی

**private** خۆیی، کەسی، تاکەکەسی، تایبەتی، ناگشتی، تایبەت بە خۆ

**process** ١ـ پرۆسە ٢ـ چارەسەر ٣ـ ڕێکخەر

**processing** ١ـ چارەسەری ٢ـ ڕێکخەری

**processor** ١ـ چارەسەرکەر ٢ـ ڕێکخەر

**product** بەرهەم

**professional** ١ـ "پیشەیی، پیشەگەرییانە". ٢ـ "پیشەگەر، پیشەوەر".٣ـ "کارناس، پسپۆڕ، لێزان".

**profile** ١ـ زانیاریی تایبەتی ٢ـ لاڕوو

**program[1]** پرۆگرام، بەرنامە

**program[2]** ١ـ پرۆگرامکردن (لە پێژمێردا) ٢ـ بەرنامەدانان

**program[3]** بەرنامە، بەرنامەی ڕادیۆیی، بەرنامەی تەلەفزیۆنی

**programmer** بەرنامەساز، بەرنامەچێکەر، بەرنامەدانەر، بەرنامەسازی کۆمپیوتەر، بەرنامەداڕێژ

**programming** بەرنامەسازی، بەرنامەچێکەری، چێکردنی بەرنامەی کۆمپیوتەر

**progress** پێشکەوتن، بەردەوامبوون، ڕەوت، چوونەپێش

**projector** وێنەنوێن، پرۆجەکتۆر

**property** تایبەتمەندی

**protect** پاراستن

**protocol** پرۆتۆکۆڵ، کۆنووس

**provider** دابینکار، دابینکەر

**proxy (server)** (**proxy**)، پراکسی، پرۆکسی، پێشکار (لە ئینتەرنێتدا، سیستەم یان شێوەناسی بۆ کۆنترۆڵی تێچوو/ دەرچووی دراوەکان لەنێوان بەکارهێنەران و ئینتەرنێت، لەنێوان پێگە و ئینتەرنێت و، یان لەنێوان بەکارهێنەران و یەک ڕاژەکاری ڕاژەکانی ئینتەرنێتدا، کە لەلایەن "ISP" [وەکوو "ناوبەست interface"ی نێوان بەکارهێنەرانی ئاسایی و ئینتەرنێت] دابەزین دەکرێ، تا لە یەک لا زانیارییەکانی بەکارهێنەر لە بیرگەی سیستەمی "ISP" لە بەردەستدا بێت و، لەلایەکی ترەوە، ئەگەری کۆنترۆڵی دەستپێگەیشتنی بەکاربەران بە ئینتەرنێت هەبێ)

**publish** بڵاوکردنەوە

| | |
|---|---|
| **pull** | ڕاکێشان |
| **pull-down** | داڕماندن، داڕووخاندن ـ داخزاو |
| **pull-dwon menu** | لیستەی داخزاو |
| **punch_card** | کارتی کونکراو |
| **punctuation** | ١ـ خاڵبەندیکردن، خاڵوبۆر بۆدانان ٢ـ خاڵبەندی، خاڵوبۆر |
| **push** | ١ـ پەستاوتن، دەستپێیانان ٢ـ (دەست)داگرتن، (دەست)خستنەسەر |
| **Python** | پایسن، زمانێکی بەرنامەداڕشتنە |

# Q, q

**QIC** = Quarter-Inch Cartridge

**QnA** = Questions and Answers

**QoS** = Quality of  Service

**QT**[1] کیوتی (نەرمەواڵەیەکی ژینگەپێشکەوتووە کە trolltech پەرەی پێ دا کە بەنەرمی بە Quasar Technologies ناوی دەرکردووە)

**QT**[2] = Quick Time

**QT**[3] = Quit talking

**QT**[4] "کیوت" (لە چات یا وتووێژی دەق بەکار دەبرێت وەکوو کورتکراوە بۆ cute, cutie واتە "جوانکیلە، خنجیلە، ئێسکسووک".)

**quad** چوارجا (لەبواری کۆمپیوتەردا بۆ پێوانی جۆرایەتی بەکار دەهێنرێت)

**quality** ١ـ جۆرایەتی ٢ـ تایبەخۆ ٣ـ نایاب، زۆر باش، باش ٤ـ چۆنێتی

**Quality of Service** (= QoS) جۆرایەتیی ڕاژە (توانای بەرهەمێک دەردەخات لە بەخشینی تەواو بۆ ئەو خزمەتگوزاری و ڕاژەیەی کە بۆی کراوە)

**Quarter-Inch Cartridge** (= QIC) پاشەکەوتکەری دراوەی موگناتیسی (ساڵی ١٩٨٣ بەرهەم هێنرا یەکەم ئامێری کۆگاکردنی زانیاری

بوو لەسەر پەپکەی موگناتیسی)

**Qubit** (= quantenbit = qbit) هاوشێوەی پێوانەی دووانییە. (یەکەی بنچینەییە بۆ پێوان، بەس ئەم وەکوو ژمارەیەکی دووانی نییە، بەڵکوو هەردووکیان پێکەوە کە باری سیستەمەکە دەردەخات)

**query** پرس، داوا، داواکاری

**Questions and Answers** (=QnA) بڕوانە FAQ، لیستەی پرسیار و وەڵامەکان

**queue** ڕیز

**quick** خێرا

**Quick Time** (= QT) "کویک تایم" (بەرنامەیەکە بۆ لێدانی مۆسیقا و ڤیدیۆ، کۆمپانیای ئەپڵ پەرەی پێ داوە)

**quit** وازهێنان، چوونەدەرەوە

**quit talking** (= QT) چوونەدەرەوە لە چات یان وتووێژی دەق

**quiz** ١ـ تاقیکاریلە، تاقیکاری (تاقیکارییەکی ناسەرەکی) ٢ـ پێشبڕکێ (ناو. بۆ وێنە ڕادیۆ و تەلەفزیۆن)

**quota** بەش

**quote** دەق، وەرگرتن

**qwerty** کوێرتی (شێوازی ڕیزبوونی پیتەکانی سەر تەختەکلیلە، کە بەشێوەی ئەمەریکی ناسراوە)

**qwertz** کوێرتز (شێوازی ڕیزبوونی پیتەکانی سەر تەختەکلیلە، لەو وڵاتانەی زمانی ئەڵمانی ئاخاوتن دەکەن و چەند وڵاتێکی تری ڕۆژهەڵاتی ئەورووپا. لەم شێوازەدا پیتیی (z) و (y) جێگایان گۆڕیوەتەوە)

# R, r

**radio** ١ـ ڕادیۆ، ئامێری ڕادیۆ ٢ـ ڕادیۆیی، تیشک ٣ـ بێتەلناردن، ناردنی ڕادیۆیی

**radio button** کلیلی ڕادیۆیی (لە پەردەپیشاندان، زاراوەی نافەرمی، لە پێوەندی لەگەڵ هەر هەڵبژاردنێک لە لیستە "مینوو"، کە بە هەڵبژاردنی، بژاردەی پێشوو لەبەرچاو ناگیرێ)

**RAID** (= Redundant Array of Inexpensive Disks) (RAID)، ڕەید، ڕیزەکی زێدەداری دیسکە هەرزانباییەکان (کەڵک لە چەند دیسکێ بەشێوەیەکی هاوکات، بێ گوێدان بە "زێدە redundant"، بۆ تاودانی خێرایی)

**RAM** (= random-access memory) "ڕەم"، "ڕام"، بیرگەی دەستپێگەیشتن-بەهەڵکەوت، بیرگەی دەستپێگەیشتنی ڕاستەوخۆ (بیرگەی ئەلەکترۆنیکیی نیوەگەیەنەر بۆ پاشەکەوتی دراوەکان بەشێوەی ڕەمزە دوودووییەکان، بە شێوەی "random access")

**RAR** ڕاڕ (ڕاڕ، لە "پێژمێری computing"دا فۆرماتێکی پەستاوتنی پەڕگەیە کە لەلایەن ئەندازیاری نەرمەواڵەی "ڕووسی"یەوە " Eugene Roshal" پەرەی پێ دراوە. سەروشەکە کورتەی "Roshal ARchive" ە)

**RAR file** پەڕگەی ڕاڕ (کۆمەڵێ پەڕگەیە بۆ ئەوەی جێی کەمتر بگرێت پەستان کراوە)

**RAS[1]** (= Remote Access Services) (RAS)، ڕاس، ڕەس، ڕاژەکانی

دوورەدەستپێگەیشتن، ڕاژەکانی دەستپێگەیشتن لەڕێی دوورەوە

**RAS**[2] = Row address strobe

**ratio** ڕێژە

**raw** خاو

**readable** شیاوی خوێندن، خوێندەنی

**real time** کاتی دروست، کاتی تەواو

**reboot** "بووت"کردنەوە، سەرلەنوێ خستنەڕێ

**recent** تازە (ڕوودان)، نوێ

**recently** تازە، لەم دواییەدا

**record** تۆمارکردن

**recovery** گەڕاندنەوە

**redo** کردنەوە

**redundant** زێدە، ناپێویست

**refresh** نوێکردنەوە، تازەکردنەوە، بووژاندنەوە

**register** تۆمار

**registration** تۆمارکردن

**registry** تۆمارگە

**regret** ١ـ پەشیمانی، پاشگەزی ٢ـ پەشیمانبوونەوە، پاشگەزبوونەوە

**reject** بەرپەرچدانەوە، پەسەندنەکردن

**relation** پەیوەندی

**release** ١ـ بەرەڵاکردن، بەردان، ئازادکردن ٢ـ بڵاوکردنەوە (فیلم، پەڕتووک، دەنگوباس ... هتد) ٤ـ دەرچوونی وەشانێکی نوێ لە نەرمەواڵەیەک

**reload** بارکردنەوە، پڕکردنەوە

**remote** دوور، ڕێی دوور

**remote control** زەفت کردن لە دوورەوە، دوورکۆنترۆڵ، دوورەکۆنترۆڵ

**remove** لابردن

**rename (1)** ناونانەوە، دیسان ناونانەوە

**RENAME (2)** "ڕینەیم" (ناو. لە "DOS" و هەندێ زمانی ئاستبەرز، فەرمانێ کە ناوی یەک یان چەند پەڕگەیەک دەگۆڕێ)

**rendering** پوختەکردن

**renew** نوێکردنەوە

**repeat** ١ـ دووپات ٢ـ دووپاتکردنەوە ٣ـ دووپاتبوونەوە

**repeater** بەهێزکەر، دووبارەکەرەوە

**replace (1)** ١ـ خستنەشوێنی خۆی ٢ـ جێگرتنەوە، شوێنگرتنەوە ٣ـ لەجێدانان ٤ـ جێگۆڕین، خستنەبریکردن، گۆڕینەوە

**REPLACE (2)** "ڕیپلەیس" (ناو. لە "DOS"دا، فەرمانێ کە پەڕگە کۆنەکانی "directory"یەک لەگەڵ پەڕگە هاوناوەکانی لە "directory"یەکی تردا، بەڕۆژ دەکاتەوە یان دەگۆڕێ)

**replication** دووپات، ڕوونووس

**request** داوا

**require** پێویستبوون

**resell** فرۆشتنەوە

**reseller** فرۆشەرەوە، دووبارە فرۆشەر

**reset** ڕێکخستنەوە

**response** وەڵام

**restart** دەستپێکردنەوە

**restore** گەڕاندنەوە

**resume** بەردەوامبوونەوە، تێچوونەوە، خستنەوەکار، بەدەستهێنانەوە

**rollback** گەڕاندنەوە

**roll-in** ناو-خلۆر (گواستنەوەی دراوەکان لە بیرگەی یاریدە بۆ بیرگەی سەرەکی)

**roll-out** دەر-خلۆر (خلۆرکردن و گواستنەوەی دراوەکان لە بیرگەی سەرەکی بۆ بیرگەی یاریدە)

**rollover** بەسەرداجوولان

**ROM** (= read-only memory) (ROM)، "ڕام"، بیرگەی تەنیا-خوێندنی (بیرگەی ئەلەکترۆنیکی لەشێوەی "بیرگەی دەستپێگەیشتن-بەهەڵکەوت" کە بەگشتی یەک جار پڕ دەبێت و بەس خوێندنییە. کۆمەڵێ لە یەک یان لە چەند تەلاشی ~ پێکهێنەری "بیرگەی ڕام"ی کۆمپیوتەرن)

**root** ڕەگ

**rotate** خولاندنەوە، کرداری سووڕدان

**rotation** سووڕ، خول

**rotation per minute** (= rpm = RPM = rot/min) سووڕ لە خولەکدا

**router** ڕێدۆز (خوێندنەوەی بەریتانی: ڕۆوتە ، خوێندنەوەی ئەمەریکی: ڕاوتەر)

**row** ١ـ ڕز، ڕیز ٢ـ دێڕ ٣ـ ڕزکردن، ڕیزکردن

**row address strobe** تیشکی ناونیشانی دێڕ (لە بیرگەی ماتریسیدا، تیشکێک کە ناونیشانی دێڕ دیاری دەکات)

**RPM** = rotations per minute rpm

**ruler** ڕاستە

**run** ١ـ جێبەجێ ٢ـ جێبەجێکردن، بەڕێوەبەردن (لە کۆمپیوتەردا، پێدانی پەڕگە بە وەرگێڕ، یان جێبەجێی پەڕگەی exe و لەو چەشنە) ٣ـ گەڕان، کارکردن، ئیشکردن (بۆ وێنە لە مەکینەدا)

**runtime** (= run time) ماوەی گەڕان، ماوەی جێبەجێکردن، کاتی جێبەجێکردن

# S, s

**save** پاشەکەوت

**save as** پاشەکەوت وەک، داگرتن وەک، هەڵگرتنەوە وەک

**scan** پشکنین، پێداگەڕی

**scanner** پشکنەر، پێداگەڕ، وێنەخوێن، وێنەخوێنەر، "سکانێر"

**scanning** پشکنین، پێداگەڕان

**scanning device** ئامێری پشکنین، ئامێری پێداگەڕان

**scene** دیمەن

**schema** گەڵاڵە، نەخشە، وێنەی پیشاندەر

**scheme** ١ـ گەڵاڵە، پلان، نەخشە، ڕێدانان ٢ـ نەخشەکێشان، ڕێدانان

**scope** بوار

**screen** پەردە

**screensaver** پەردەپارێز

**script** نووسراو، سکریپت، دەستنووس، نووسینە

**script editor** دەستکاریکەری نووسینە

**script file** پەڕگەی نووسینە

**scriptwriter** نووسەر (لە ڕاگەیێنەکاندا، زاراوەیەکی گشتییە واتە نووسەری ناوەڕۆک و دەقی فیلم، ناوەڕۆک و دەقی بەرنامەی تەلەفزیۆنی، ناوەڕۆک و دەقی خوێندن لە ڕادیۆ و هتد)

**scroll** ١ـ کێشان ٢ـ پێچۆکە ٣ـ پێچۆکەنواندن، پێچۆکەنوێنی
٤ـ پێچۆکەگەری (پیشاندانی ناوەڕۆک و دەق لە پەردەپیشاندا، بەشێوەی لاپەڕەی وا کە وەکوو پێچۆکە (طومار) تێدەپەڕێت)

**scroll arrow** تیرەپێچۆکە

**scrollbar** (= scroll box) تووڵەکێشان، تووڵەپێچۆکە، تووڵەپێچۆکەدان (لە GUIدا، ئەو تووڵانەی کە لەلای ڕاست یان لەلای خواری پەنجەرەیەکن و، بە مشک و بە تیرەکلیلەکان دەکرێ هەڵبژێردرێن یان بگۆڕدرێن. بە هەڵبژاردن و گۆڕانی، دەتوانرێ ژوور یان خوار، لای ڕاست یان چەپی ناوەڕۆک و دەقەکە، وەکوو پێچۆکە (طومار)یەک لەسەر پەردەدا پیشان بدرێت)

**scroll box** = scrollbar

**scroll buffer** نێوانگری پێچۆکە

**scroll down** داکێشان، پێچۆکەداکێشان

**scrolling** پێچۆکەگەری، بەپێچۆکەپیشاندان

**scroll left** ١ـ چەپڕۆیی پێچۆکە (جووڵانی ئاسۆیی پەردەپیشان بەشێوەی پێچۆکەیەک بۆ لای چەپ) ٢ـ بۆ لای چەپ ڕۆیشتنی پێچۆکە ٣ـ بۆ لای چەپ بردنی پێچۆکە)

**scroll right** ١ـ ڕاستڕۆیی پێچۆکە (جووڵانی ئاسۆیی پەردەپیشان بەشێوەی پێچۆکەیەک بۆ لای ڕا ست) ٢ـ بۆ لای ڕاست ڕۆیشتنی پێچۆکە ٣ـ بۆ لای ڕاست بردنی پێچۆکە

**scroll up** هەڵکێشان، پێچۆکەهەڵکێشان

**scrollbar** تووڵەکێشان، تووڵەپێچۆکە

**scrub** خاوێنگەریی بیرگە (سڕینەوە و لابردنی تەواوی زانیارییەکان لە دیسک یان لە بیرگە)

**SCSI** (= Small Computer system Interface) **(SCSI)**، "سکازی" (ناوبەستی کۆمپیوتەری بچووک. یەکێک لە ستانداردەکانی خولگەی

ناوبەست بۆ پێوەنددانی کۆمپیوتەر بە ئامێرە دەرەکییەکان، بەتایبەت دیسکلێخوڕ، کە لەلایەن ANSI ئامادە کراوە)

| | |
|---|---|
| **search** | گەڕان، پشکنین |
| **search engine** | مەکینەی پشکنەر، ماتۆڕی پشکنەر، نەرمەواڵەی پشکنەر (نەرمەواڵە، بەرنامە، فەرمان، یان بەشێک لە نەرمەواڵەیەک، کە بۆ جێبەجێکردنی "پشکنین" بەکار دەبرێت) |
| **searcher** | پشکنەر، گەڕانکار، بگەڕ |
| **security** | پاراستن، ئاسایش |
| **seed** | تۆو، تۆوکردن، چاندن |
| **selection** | دیاریکردن |
| **selsyn (= synchro)** | "سێلسین" (ناو. جۆرێک سیستەمی کۆنترۆڵ) |
| **send** | ناردن |
| **sensor** | هەستەوەر |
| **sequence** | ڕیزە، زنجیرە |
| **serial** | زنجیرەیی |
| **series** | زنجیرە |
| **server** | ڕاژەکار |
| **service** | ڕاژە |
| **session[1]** | خولێکی کاری، دانیشتن، کۆڕ (بۆ نموونە خولێک یان دانیشتنێکی کاری لەگەڵ ڕایەڵەدا) |
| **session[2]** | کۆڕی وانە، وانەکۆڕ، پۆل |
| **setting** | ڕێکخستن |
| **settings** | ڕێکخستنەکان |
| **setup** | جێگیرکردن |
| **shape** | شێوە، شێواز |
| **share[1]** | ١ـ بەش، پشک، بەرکەوت ٢ـ بەشکردن، دابەشکردن ٣ـ هاوبەشیکردن، بەشکردن لەگەڵدا |

**SHARE**[2] "شەیر" (لە DOS دا فەرمانێ کە بەرنامەی "SHARE" بۆ جێگیرکردنی هاوبەشگەری و قوفڵی پەڕگە لە دیسک و ڕایەڵەدا جێبەجێ دەکا)

**shareware** هاوبەشەواڵە، (نەرمەواڵەیەک کە فرۆشیار بەبێ وەرگرتنی پارە دەیدات بە کڕیار یان کڕیارەکە دەتوانێ کۆپییەکی لە هەرکەس وەرگرێ و تاقیی کاتەوە، بەڵام ئەگەر هات و بە دڵی بوو و پەسەندی کرد و بیەوێ بەکاری بهێنێ، ئەرکی سەرشانیەتی پارەکەی بدات بە چێکەرەکەی)، پرۆگرامی بڵاوکردنەوە

**shareware/freeware** هاوبەشەواڵە/ خۆڕاییواڵە

**sheet** پەڕە

**shell**[1] چوونەدەرەوە بۆ سیستەم، "شێڵ"

**shell**[2] ١ـ تێکڵ ٢ـ قاوغ

**shell script** نووسینە (سکریپت)ی "شێڵ"

**shift**[1] ١ـ شوێنگۆڕین، گواستنەوە ٢ـ شوێنگواستنەوە، شوێنگۆڕان

**shift**[2] گۆڕەر (ناو. لە مەکینەی نووسین و تەختەکلیل)

**SHIFT**[3] "شیفت" (ناو. لە "DOS"دا، فەرمانێ کە لە پۆلەبەرنامەکاندا، شوێنی ئەو پارامەترانەی دەتوانن بگۆڕدرێن، دەگۆڕێ)

**shift**[4] نۆرەی کاری، نۆرەکار، شیفت

**short** کورت

**shortcut** قەدبڕ

**sign in** واژۆکردن

**signature** واژۆ

**site** شوێن، جێ، پێگە، بنکە

**skin** پێست

**slash** لارەهێڵ

**slice** پارچە، قاژ، کەرت

**slide** سلايد

**slide layout** گەڵاڵەبەندیی سلايد

**slot** قلّيش

**Smart buisness** کاسبیی زیرەکانە

**Smart phone** تەلەفۆنی زیرەک، تەلەفۆنی هۆشمەند

**socket** پێکەوەبەست

**software** نەرمەواڵە، نەرمەئامێر، کاڵانەرم

**software platform** سەکۆی نەرمەواڵە

**sound card** کارتی دەنگ

**source** سەرچاوە

**space** بۆشایی

**spacebar** نێوانتووڵ

**spam** پۆستی نەخوازراو

**spoof (ed) web site** وێبگەی ساختە

**spool** نۆرە

**spyware** سیخوڕیواڵە، پرۆگرامی سیخوڕی

**SQL** (= Structured Query Language) سیکوێڵ (زمانی داخوازیکردنی وەرگرتنی زانیارییە، کۆمپانیای IBM بەشی توێژینەوە ساڵی ١٩٧٤ دایهێنا)

**SSH (**= Secure Shell) ئێس‌ئێس‌ئێچ (پرۆتۆکۆلێکی پارێزراوە بۆ کارکردن لە دوورەوە)

**standalone** سەربەخۆ

**standard** ئاسایی، پێوانە، نموونەیی، ستاندارد

**start** دەستپێکردن، دەستپێک

**startpage** دەستپێکردن، لاپەڕەی دەستپێک

**stationary** جێگیر

**statistics** سەرژمێری، زانستی

**status** ئاست، دۆخ

**storage**[1] بیرگە (ناو. زاراوەی گشتی بە واتای هەموو جۆرە بیرگەیەک، بریتییە لە "RAM" و "ROM" و دیسک و نەوار "شریت" و هتد)

**storage**[2] (= auxiliary storage) بیرگەی یاریدە (ناو. بریتییە لە دیسک و شریت)

**storage**[3] (= memory) بیرگەی سەرەکی (ناو. بریتییە لە "RAM" و "ROM")

**storage**[4] پاشەکەوت، پاشەکەوتگەری

**store** کۆگا، کۆگاکردن

**storekeeping** کۆگا

**story board** پێگەی کارکردن

**stream** تەوژم

**string** ڕیزبەند، زنجیرەنووسە

**strobe** تیشک، تیسک، ترووسک، ڕووناکی، پرشنگ

**structure** پێکهاتە

**style** شێواز

**sub-** "ژێر-"

**subnet** (= subnetwork) (subnet)، ژێرڕایەڵە، داپۆشەری

**subnet mask** (subnet mask)، پۆششی ژێرڕایەڵە

**subscribe** بەشداربوون

**support** پاڵپشتکردن، پاڵپشتیکردن، پشتیوانی

**surfing** وێبگەردی، وێبگەڕی

**switch** کلیل، سویچ

**symbol** نیشانە، هێما

**SYN** [1] (= Synchronizing Segment) "سین"، پارچەی هاوکاتگەر (ناو. لە TSP/IP)

**SYN** [2] (= synchronizing character) "سین"، نووسەی هاوکاتگەر (ناو)

**SYN** [3] (= synchronous idle) "سین"، بەتاڵیی هاوکاتگەر (ناو و ئاوەڵناو)

**sync** (= synchronization) هاوکاتگەری (ناو. زاراوەی نافەرمی)

**sync bit** بیتی هاوکاتگەری

**SYN character** = synchronous idle character

**synchro** [1] (= self-sychronous device) هاوکاتگەر، هاودەمگەر "سەنکرۆ" (ناو. سیستەمی ئەلەکتریکیی کۆنترۆڵدار، بۆ کۆنترۆڵ، ناردن و وەرگرتنی جێگۆڕکێی گۆشەیی یان جووڵەی گۆشەیی)

**synchro-** [2] "هاوکات ـ" (پێشکۆ)

**synchro** [3] = selsyn

**synchronise** = synchronize

**synchronism** هاوکاتی، هاودەمی، هاوهەنگاوی

**synchronization** [1] (= sync) هاوکاتی، هاودەمی (ناو)

**synchronization** [2] (= synchronizing) هاوکاتگەری، هاوکاتسازی

**synchronization bit** بیتی هاوکاتگەری

**synchronization character** نووسەی هاوکاتگەری

**synchronization field** بواری هاوکاتگەری

**synchronization pattern** شێوەئاسای هاوکاتگەری

**synchronization pulse** (= sync pulse) پرتەی هاوکاتگەری

**synchronization signal** = sync signal

**synchronize** (= synchronise) هاوکاتکردن، هاودەمکردن،

هاوهەنگاوکردن

**synchronized** هاوکات، هاودەم

**synchronizer** هاوکاتگەر

**synchronizing** ١ـ هاوکاتگەری (ناو)

٢ـ هاوکاتگەر، هاوکاتساز (ئاوەڵناو)

**synchronizing character** = SYN

**Synchronizing Segment** = SYN

**synchronizing signal** نیشانەی هاوکاتگەر

**synchronous** هاوکات، هاودەم

**synchronous idle character** (= SYN character) نووسەی بەتاڵی هاوکاتگەری، نووسەی بێکاروئیشیی هاوکات (نووسەیەک کە زانیارییەکی لەباردا نییە و تەنیا بۆ هاوکاتگەری بەکار دەچێ، بۆ وێنە: نووسەی خاوەن نهێنیی ٢٢ لە "ئەسکی"دا)

**syntax** ڕستەکار، داڕستن، ڕستەسازی

**system** سیستەم

**system administrator** بەڕێوەبەری سیستەم (ئەو کەسەی کە لێپرسراوە لە بەڕێوەبردنی چەند کۆمپیوتەرێک لە سیستەمێکدا)

**system programmer** بەرنامەداڕێژی سیستەم

# T, t

**tab (1)** سەرخشتە، "تاب" (ئەو ستوونەی کە هەموو دێڕەکانی پەڕە، لەو خاڵەدا، هاوستوون دەبن)

**tab ( 2)** بازدان، بازپێدان، پەڕاندن، خشتاندن، جووڵەکردن لە خشتەدا (لە منوو و لیستە، جووڵەکردن لە بوارەکانی بژاردەکان و خانەکانی خشتە، بەبێ کەڵکوەرگرتن لە مشک و، یان لێدانی یەک بە دوای یەکی "کلیلی بازدان tab key")

**tab (3)** ١ـ کلیلی خشتەبەندی ٢ـ لێدانی کلیلی خشتەبەندی

**tab (4)** زمانە، گوێچکەکارت

**Tab key** بازدەر، دوگمەی تاب

**tabbing** ١ـ خشتەبەندی ٢ـ لێدانی کلیلی خشتەبەندی، بازدان، بازپێدان

**table** خشتە

**tablet computer** تەختەپێژمێر، تاتەپێژمێر

**Tablet PC** تەختەپێژمێری کەسی، تاتەپێژمێری کەسی

**tag** تاگ

**tape** شریت، نەوار، تۆمارکردن لەسەر شریت (نەوار)

**tape drive** لێخوڕی نەوار، وەگەڕخەری نەوار

**target** مەبەست، ئامانج

**task** کار، ئەرک

**taskbar** تووڵی کار

**TB = terabyte** تێرابایت

**TCP** (= Transmission Cortol Protocol) تی‌سی‌پی، پرۆتۆکۆڵی کۆنترۆڵی گواستنەوە، کۆنووسی کۆنترۆڵی ناردن (لە پێوەندییە دراوەیییەکاندا، کۆنووس یان ستانداردێ کە بۆ ناردن و وەرگرتنی دراوەکان لەنێوان چەند کۆمپیوتەرێکدا بەکار دەبرێت. جۆرێکی TCP/IP یە)

**TCP/IP** (= Transmission Cortol Protocol/Internet Protocol) (TCP/IP)، تی‌سی‌پی/ئای‌پی، پرۆتۆکۆڵی کۆنترۆڵی گواستنەوە/ پرۆتۆکۆڵی ئینتەرنێت (پرۆتۆکۆڵ یان ستانداردی ئینتەرنێت، بۆ بەدیهێنانی پێوەندیی جیهانیی کۆمپیوتەرەکان)

**TCP-IP** = TCP/IP

**TCP/IP Protocol Family** بنەماڵەی پرۆتۆکۆڵەکانی تی‌سی‌پی/ ئای‌پی

**technology** تەکنۆلۆژیا، تەکنیکزانی، پیشەزانی

**tele-education** دوورەفێرکاری

**telework** دوورکاری

**telework center** بنکەی دوورکاری، ناوەندی دوورکاری

**telex** (= TX) تێلێکس، تەلەفۆنی دەقی، دەقەتەلەفۆن

**Telnet** (Telnet)، تێل‌نێت (ناوی بازرگانی. ئامێر و ڕایەڵەیەکی کۆن لە ئینتەرنێتدا، لەسەر بنەمای یونیکس، کە بۆ ناردن‌وەرگرتنی دەق و بەرنامە کار دەکات. بەکارهێنەر دەتوانێ ڕاستەوخۆ بچێتە نێو پێگەکانی تێل‌نێت و، لەگەڵ بەرنامەکانیدا ڕاستەوخۆ کار بکات)

**template** داڕێژە

**temporary** کاتی

**tera-** تێرا (وەکو پێشگر بۆ یەکە پێوانەییەکان، واتە "$10^{12}$"، بۆ پێوانی قەبارەی بیرگە بەکاردەهێنرێت لە کۆمپیوتەردا)

**Terabyte** = TB تێرابایت (توانای قەبارەی بیرگەیەکە،

دەکاتە ١٠٠٠ یاخود ١٠٢٤ گیگابایت)

**term** — زاراوە، دەستەواژە، واژە

**terminal** — تێرمیناڵ، کۆتاگە

**terminate** — کۆتاییپێهێنان، لەناوبردن

**text** — دەق

**text editor** — دەقنووس، دەستکاریکەری دەق

**text processing** — دەقرێکخەری، دەقکاری

**text processor** — دەقرێکخەر، دەقکار

**text string** — دەقەریزبەند

**texture** — چنین، ڕستن

**TFT** (= Thin Film Transistor) — تی ئێف تی (مۆنیتۆرێکی (LCD)یە کە لەسەر کۆمپیوتەرە هەڵگرتەنییەکان و شاشە تەختەکاندایە. هەروەها وەک "ماتریس"ی چالاکیش بەناوبانگە)

**theme** — ١ـ باس، سەرباس، بابەت ٢ـ وتار ٣ـ ئاواز

**third-generation computers** — سێهەم وەچەی کۆمپیوتەر، سێهەم چەرخی کۆمپیوتەر (یەکەم قۆناغ بوو کە سوورە تەواوی ئەلیکترۆنی " integrated circuits" تیا بەکارهات)

**timeline** — کاتهێڵ

**Time-to-live** (= TTL) — کاتی ژیان، کات-بۆ-ژیان (لە ڕایەڵەدا، ئەو ماوەیەی کە "datagram"ێک دەتوانێ لەسەر هێڵدا بێت)

**tips** — ڕێنیشاندان، ڕوونکردنەوە

**title** — سەردێڕ

**toggle** — زامن (زوانە یان گیرەیەک کە لە جووڵە و جێبەجێبوونی تیکەیەک لە ئامێرێکدا بەرگری دەکات)

**tool** — ئامراز

**toolbar** تووڵامراز، میلامراز

**top** لووتکە، سەرتۆپ

**topic** بابەت

**topology** تۆپۆلۆژی، شێوەناسی

**touch** ساو، ساوان، دەستلێدان، دەست پێهێنان

**touch mobile** ساومۆبایل

**touch screen** ساوپەردە

**track**[1] ١ـ شەقار (لە دیسکدا)، لێوارە (لە شیریتدا) ٢ـ شوێنپێ ٣ـ شوێنکەوتن، سۆراخکردن

**track**[2] "ترەک"، "تراک" (لە "سیدی"ی مۆسیقادا، هەر کام لە پارچە مۆسیقا تۆمارکراوەکان)

**track address** ناونیشانی شەقار (لە دیسکدا)

**trackback** ڕێباز، ڕێچکە

**trackball** (= track ball) گۆسووڕ (ئامێرێکی تێچووە کە بریتییە لە گۆیەک کە سووڕ دەخوات و، بە سووڕاندنی، زانیارییەکانی جێنیشاندەر دەچێتە ناو کۆمپیوتەرەوە. ئەرکی گۆسووڕ وەکوو ئەرکی "مشک"ە)

**transaction** ڕێککەوتن، گواستنەوە

**transfer** گواستنەوە

**transform** گۆڕین

**transmission** ناردن

**transparent** ڕوون، ڕۆشن، پاشبین

**trick** فێڵ، تەڵە

**tridimensional** سێلایی

**trojan horse** ئەسپی ترۆجان / تەروادە (جۆرە بەرنامەیەکی تێکدەری وەکوو ڤایرۆس)

**TTL**[1] (= transistor-transistor logic) (TTL)، تیتیئێڵ

| | |
|---|---|
| | (ژیربێژیی ترانزیستۆر- ترانزیستۆری) |
| **TTL²** = Time-to-live | کاتی ژیان، کات-بۆ-ژیان |
| **turbo** | خێرا (زاراوەیەکە بۆ خێرا کارکردنی سیستەم یا بەرنامەیەک بەکارهێنراوە) |
| **TWAIN** (= technology without an interesting name) | تواین (کۆنووسێکە بۆ هێنانی وێنە لە ئامێرێکی ڕووپێو "scanner"ەوە لە بەرنامەیەکی بەکاربەریدا کە بۆ ئەو مەبەستە بەکار دەهێنرێت) |
| **twitter** | تویتەر (تۆرێکی کۆمەڵایەتیی بەرفراوانە، دەتوانێت لە ڕێی پەیامی کورتەوە (١٤٠ نووسە) هەواڵی نوێت بە دۆستەکانت بگەیەنێت لە تۆڕەکەدا، ماڵپەڕی فەرمی (wwww.twitter.com |
| **type** | ١. جۆر ٢. چاپکردن |

# U, u

**Ubuntu** ئوبونتوو (سیستەمێکی کارپێکردنی خۆڕاییە کە لەلایەن بەکارهێنەرانەوە چێ کراوە)

**UCP[1]** (= universal computer protocol) "یووسیپی"، کۆنووسی گشتیی کۆمپیوتەر، کۆنووسی جیهانیی کۆمپیوتەر

**UCP[2] (**UNIX-to-UNIX Copy Protocol**)** "یووسیپی"، کۆنووسی لەبەرگرتنەوەی یونیکس-بۆ یونیکس

**UDA** (= Universal Data Access) "یوودیئەی"، دەستپێگەیشتنی دراوەی جیهانی

**UDF** (= Universal Disk Format) "یوودیئێف"، فۆرماتی جیهانیی دیسک

**UDMA**

**UDO** (= Ultra density optical) "یوودیئەو"، ڕووناکیی لەژوورچڕی

**UDP** (= User Datagram Protocol) "یوودیپی"، کۆنووسی داتاگرامی بەکارهێنەر (لە ئینتەرنێتدا، جۆرە پرۆتۆکۆلێکی تایبەت بە ناردنی دراوەکانی "stream" کە بە مۆدی "packet" کار ناکات). (کۆنووسێکی پەیوەندییە کە ڕاژەیەکی سنووردار پێشکەش دەکات کاتێ پەیامەکان دەگۆڕدرێنەوە لەنێوان کۆمپیوتەرەکان لە ڕایەڵەیەک کە پرۆتۆکۆلی ئینتەرنێت بەکار دەبات)

**UHF** (= ultrahigh frequency = decimetric waves) "یووئێچئێف"، لەرەی لەژووربەرز (لەرەکانی لەنێوان ٣٠٠ میگاهێرتز تا ٣٠٠٠ میگاهێرتز)

**UI (=** user interface) "یووئای"، ناوبەستی بەکارهێنەر، نێوانەرووی بەکارهێنەر

**UIML** = User Interface Markup Language "یووئایئێمئێڵ"، زمانی هێمادانانی ناوبەستی بەکارهێنەر (زمانێکی ڕاڤەکەرە کە ڕێگە دەدات وێبپەڕێک چێ بکرێ کە دەتوانرێ بنێردرێت بۆ جۆرێک لە "کارتخوێنەرەکان". بۆ وێنە پێژمێرێ لەگەڵ پەردەپیشانێکی گەورە و تەختەکلیلێک یان "phone smart"ێک بە پەردەپیشانێکی بچووک و بێ هیچ تەختەکلیلێ)

**ultra-** لەولا، لەژوور، لەوپەڕ (پێشگر)

**UML[1]** = Unified Modeling Language "یووئێمئێڵ" (زمانێکی مۆدێلیی یەکگرتووی گشتی)

**UML[2]** **(**=User-Mode Linux) (UML)، "یووئێمئێڵ" (شێوازێکی هێمن و پارێزراوە بۆ گەڕانی وەشانەکانی لینوکس و پرۆسەکانی لینوکس) http://user-mode-linux.sourceforge.net

**UMS** (UMS)، "یووئێمئێس" (بەڕێوەبردنێکی پەیامە دەنگی، فاکسی و دەقە ئاساییەکانە وەک تەنەکانی ناو تاکە نامەدانێک، کە بەکارهێنەر یان بەهۆی ڕاژەخوازێکی پۆستە ئەلەکترۆنییەکی ئاساییەوە یان بەهۆی تەلەفۆنەوە، دەتوانێ دەستپێگەیشتنی پێ هەبێت)

**UMTS** (UMTS)، "یووئێمتیئێس"، سیستەمی پێوەندیی بێتەلی گەرۆکی جیهانی (سیستەمێکە بە واتای بەرینباندی، ڕاگواستنی دەق، وێنە، دەنگ، ڤیدیۆ و فرەڕاگەیەنەکان "ڕەنگاڵە" لەسەر بنەمای گورزەبیتی، بە خێراییی گواستنەوەی ٢ میگابیت لە چرکەدا)

**unary** یەکانی

**UNC** = Universal Naming Convention

**underscore** بنهێڵ

**undo** پووچکردنەوە، هەڵوەشاندنەوە، سڕینەوە

**undo buffer** نێوانگری پووچەڵکردنەوە

**undo disk** پەپکەی پووچکردنەوە

**Unicast** یونیکەست

**Unicode** یونیکۆد

(کۆدکردنێکی گشتییە بۆ سیستەمەکانی کۆمپیوتەر لە جیهاندا. هەموو پیتێک و ژمارەیەک یان نووسەیەک (character) کۆدێکی تایبەتی هەیە. ئەم کۆدە هەر هەمان کۆدە و نەگۆڕە لەسەر هەر سیستمێک، لە هەر پرۆگرامێک یان بۆ هەر زمانێک. ئەم کۆدە پێی دەڵێین یونیکۆد و ڕێکخراوێکی جیهانی سەرپەرشتی بڵاوکردنەوە و پێناسکردنیان دەکات.)

**Unicode Transformation Format** (=UTF)

**Unified Modeling Language** (= UML) زمانی یەکگرتووی مۆدێلدانان (لە ئەندازیاریی بەرنامەداڕشتندا بەکار دەهێنرێت بە تایبەت لە تەنخوازیدا "OOP")

**uninstall** دامەزرانسڕی، دامەزرانسڕینەوە، هەڵوەشاندنەوە

**union** یەکێتی

**unique** بێهاوتا، بێوێنە

**unit** یەکە

**Universal Naming Convention** (= UNC) پەیمانی ناونانی جیهانی (پەیمانی جیهانی بۆ ناونانی ناو و ناونیشان لە ڕایەڵەدا. ناوی نەرمەواڵە)

**Universal Plug and Play** (=UPnP)

**Universal Resource Locator** (=URL)

**Universal Serial Bus** (=USB)

**UNIX** (=UNiplexed Information and Computing Service) یونیکس (سیستەمێکی کارپێکردنە)

**unmute** نەکپاندن، کپنەکردن، دەنگبەردان

**unsigned** بێنیشانە، بێهێما

**up-time** (= uptime) کاتی کردنەوە، کاتی چالاکی

**update** نوێکردنەوە، ئەمڕۆژیکردن، بەڕۆژکردن

**upgrade** بەرزکردنەوە

**uplink** بارکردن، سەرخستن

**upload** بارکردن

**UPnP** (UPnP)، پێوەکردن و لێدانی جیهانی

(ستانداردێکە کە ئینتەرنێت و پرۆتۆکۆڵەکانی وێب بەکار دەهێنێ و توانا دەدات بە کەرەستەکانی تری وەکوو پێژمێر، لائامێرەکان، کەرەستە پێشکەوتووەکان و یەکە بێتەلەکان کە لە ڕایەڵەیەکدا پێوەند بدرێن و خۆکارانە یەکتر بدۆزنەوە)

**UPS** (= uninterruptible power supply) (UPS)، سەرچاوە وزەبەخشی بێپچڕان

**upstream** سەرخستن، ڕەوتی بەرەوبان، ڕەوتی بەرەوسەر، ڕەوتی بەرەوژوور، ڕەوتبان، ڕەوتسەر (لە تەلەفۆنیدا، ڕەوتی پێچەوانەی ڕێڕەوی نێرەر بۆ وەرگر)

**up-time** (= uptime) کاتی کردنەوە، کاتی چالاکی

**URI** (= Uniform Resource Identifie) (URI)، "یووئارئای"، ناسێنەری سەرچاوەی چوونیەک (ناوی گشتی بۆ هەموو جۆرە ناو و ناونیشانێک کە ئاماژە دەکەنە "تەن object" لە "World Wide Web". یەک "URL" جۆرێکە لە "URI")

**URL** (= Universal Resource Locator = Uniform Resource Locator) (URL)، ئرڵ، یووئارئێڵ، شوێندۆزی سەرچاوەی جیهانی (لە ئینتەرنێتدا، "ناونیشانی وێب")

**USB** (= Universal Serial Bus) "یووئێسبی"، تێپەڕگەی زنجیرەبەستی گشتی (جۆرە ستانداردێکی تێپەڕگە بۆ هەموو جۆرە لائامێرێکی خێرایی-خوار و خێرایی-مامناوەندی)

**user** بەکارهێنەر

**user ID** پێناسەی بەکارهێنەر

**user name** ناوی بەکارهێنەر

**user-friendly** بەکارهێنەرپەسەن

**User interface** (= UI)

**USSD** (USSD)، "یووئێسئێسدی"، ڕاژە دراوەی پاشکۆییی

نارێکپێکهاتوو (سیستەمێکی جیهانییە بۆ تەکنۆلۆژیای پێوەندیی "GSM"ی مۆبایل، بۆ ناردنی دەق لەنێوان تەلەفۆنێکی گەڕۆک و پرۆگرامێکی "بەکاربەری application" لە ڕایەڵەدا)

**UTF** (=Unicode Transformation Format) کڵێشەی گۆڕینی یونیکۆد

(پێوانەییەکە بۆ پێناسکردنی یونیکۆد، تاکوو کۆدکردنە یەکگرتووەکە بتوانێت کە لەگەڵ هەموو پێوانەییەکانی تردا بگونجێت. باوترین جۆری "UTF-8"ە)

**utility** بەکەڵک، سوودمەند، سوودمەندی

(بەرنامەیەکە کە هاوکاریی سیستەمێک دەکات بۆ بەجێهێنانی کارێکی لاوەکی، واتە ئەرکی سەرەکیی سیستەمەکە بەجێ ناهێنێت)

**UTP** (UTP)، "یووتیپی"، جووتەکێبڵی بادراوی بێپۆشەر

("جووتەبادراو Twisted Pair"، جۆرە کێبڵێکە کە بەکار دەبرێ بۆ پێوەندیی تەلەفۆنی و پێک هاتووە لە چەند سەد تەلی مسینی تەراخراو لە پۆششێکی هاوبەشدا. گەیەنەرێ لە جووتەکەدا زانیارییەکان هەڵدەگرێ و ئەوی تر تەلی زەویدارە و لەڕێی بادان زەبرەکە کەم دەکاتەوە. کێبڵەکان بە دوو جۆرن: "کێبڵی بێپۆشەر unshielded twisted pair, UTP" و "کێبڵی پۆشەردار STP ,shielded twisted pair")

# V, v

**value** نرخ، بەها

**variable** گۆڕاو

**VB** = Visual Basic

**VBA** = Visual Basic for Application

**VBS** = Visual Basic Script

**VBScript** (= Virtual Basic Script = VBS) ڤیبیسکریپت

(ژێرکۆمەڵێ لە بەیسیکی وێنەیی، کە بەتایبەت لە بەرنامەداڕێژی بۆ وێب بەکار دەبرێ)

**VCD** (= Video Compact Disc) ڤیسیدی (ڤیدیۆی دیسکی پەستاوتە)

**vector** ئاراستەبڕ

**vendor** فرۆشیار

**verbose** درێژە

**verify** ١ـ سەلماندن، بەڵگەبۆهێنانەوە ٢ـ ساغکردنەوە (ڕاستیی شتێک)

**version** وەشان

**video** ١ـ ڕەنگی، وێنەیی، ڤیدیۆ ٢ـ ڕەنگ، وێنە، ڤیدیۆ

**view** ١ـ بینین ٢ـ پیشاندان

**virtual** گریمانە، گریمانەکی

**virtual LAN** گریمانە ڕایەڵەی ناوخۆیی

**Virtual Private network** (= VPN) گریمانە ڕایەڵەی خۆیی، ڕایەڵەی خۆییی گریمانەکی

**virus** ڤایرۆس

**visible** بینراو، دەرکەوتوو

**visual** بینراو، دیدەیی، دیدەنی، دیداری

**Visual Basic** (= VB) ڤیژواڵ بەیسیک، بەیسیکی دیدەیی

(جۆرە بەیسیکێکی تاڕادەیەک نوێی پێشکەوتوو، کە دەتوانێ بۆ بەرنامەداڕێژیی تەنخواز بەکار بێت)

**Visual Basic for Application** (= VBA) ڤیژواڵ بەیسک بۆ پەرەپێدانی بەرنامەی بەکاربەری

**Visual Basic Script** (= VBS) ڤیژواڵ بەیسیک سکریپت، سکریپتی بەیسیکی دیدەیی

**VLAN** = virtual LAN

**voice** دەنگ

**Voice Card** کارتی دەنگ

**VOIP**(= Voice Over IP) گواستنەوەی دەنگ لە ڕێگەی (IP)ەوە

**Voice Over IP**

**volume** پلەی دەنگ، قەبارە، بەرگ

**VPN** = Virtual Private network

**vulnerable** بەرگەنەگر

# W, w

**W3C** (=World Wide Web Consortium) ڕێکخراوی وێب

(کۆمەڵەیەکی جیهانییە، ساڵی ١٩٩٤ پێک هێنراوە، کاریان پێناسەکردنی پێوانەیی گونجاوە بۆ وێب. بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە www.w3.org)

**WAN** (= Wide Area Network = wide-area network) (WAN)، وان

ڕایەڵەی ڕووبەربڵاو

**Wap[1] (=** wireless application protocol**)** (wap)، "واپ"،

پرۆتۆکۆلی بەکاربەریی بێتەل (ستانداردێکە بۆ گواستنەوەی دەق و گرافیک بۆ تەلەفۆنە گەڕۆکە دیجیتالەکان وەک تەلەفۆنەکانی "GSM")

**Wap[2] (=**Wireless Access Point**)** (wap)، "واپ"، خاڵی دەستپێگەیشتنی بێتەل

**ware** واڵە، ئامێر، کاڵا (وشەیەک کە لەگەڵ هەندێ وشەی تر دێت، وەکوو نەرمەواڵە، ڕەقەواڵە)

**Warez** وارێز (پرۆگرامێک کە کۆپی دەکرێ بە شێوەیەکی نایاسایی و لە ڕێگەی ئێنتەرنێتەوە بلاو دەکرێتەوە)

**watchdog** پارێزەر، پاسەوان، سەگی پاسەوان

**watchdog timer** (= WDT) کاتپێوی پاسەوان (یەکەیەک یان کارتێکی ئەلەکترۆنییە کە هەندێ کردە جێبەجێ دەکات پاش هەندێ کاتی دیاریکراو ئەگەر شتێک هەڵە ببێت لە سیستەمێکی ئەلەکترۆنی و سیستەمەکە لە خۆیەوە نەگەڕێتەوە)

**wav** (wav, wave)، "واڤ، وەیڤ"

("wav" کە بە "وەیڤ wave"یش دەخوێنرێتەوە، جۆرە فۆرماتێکی پەڕگەی دەنگییە کە لەلایەن مایکرۆسۆفتەوە چێ کراوە. بووە بە پەڕگەفۆرماتێکی ستانداردی ئاودیۆ بۆ هەموو شتێک، لە دەنگەکانی سیستەم و یارییەوە بگرە هەتا "بیستەنی بە چۆنایەتیی سیدی CD-quality audio". پەڕگەکانی واڤ دەتونرێ لەسەر سیدییەک بسووتێنرێ بۆ ئەوەی پاشتر لە سیدیلێدەرێک لێ بدرێتەوە. پەڕگەیەکی وەیڤ وەها دەناسرێتەوە کە لە کۆتاییەکەیدا درێژکراوەی ".WAV" هەیە. فۆرماتێکی هاوتای ئەمە لە ماکینتۆش و لینوکس پێی دەوترێ "AIFF")

**wave**[1] شەپۆل

**wave**[2] (بنوارە wav)

**web** وێب

**web browser** وێبگەڕ

**web page** وێبپەڕ، وێبپەڕە

**webcam** (= web camera) وێبکام، کامێرای وێب

**webcast** پەخشی وێب، وێبپەخش

**webcasting** وێبپەخشی (پەخشکردنی دەنگ و ڕەنگ بە هۆی ئێنتەرنێت)

**WebDAV** (WebDAV)، "وێبداڤ"

("وێبداڤ" پرۆتۆکۆلێکە کە ئەو ئەگەرە پێک دەهێنێ کە زانیاری بنووسرێ، دەستکاری بکرێ و دابەش بکرێت لەسەر ئینتەرنێت، ئینترانێت، و ئێکسترانێت. کۆنووسەکە لەسەر بنەمای "XML"ە)

**weblog** وێبلۆگ

**webmaster** وێبداڕێژ، وێبکار، وێبگەر، بەرپرسی وێب

(لە ئینتەرنێتدا، کەسێ کە بەرپرسێتیی بەڕێوەبەرایەتیی وێبگەکان، نەرمەواڵەکان و ڕەقەواڵەکانی "ڕاژەکار server"ی بەئەستۆیە)

**webserver** ڕاژەکاری وێب، وێبڕاژەکار

**website** وێبگە

**whois** هووئیز (لە ئینتەرنێتدا، نەرمەواڵەیەک کە یارمەتیی بەکارهێنەر دەدات تا بەکارهێنەران و سەرچاوەکانی تری ئینتەرنێت بدۆزێتەوە)

**wideband** پانەباند

**widget** "ویجیت"

(ئەمە لەڕاستیدا بە شتێکی بێنرخ یان بە خرتوپرت دەوترێ. بە شتێ کە زۆر ورد و بچووکە و هیچ ناوێکی نییە. لە بواری ئایتیدا جاروبار سەرهەڵدەدا و بە نیشانەیەکی بێنرخ دادەنرێ بۆ وێنە لە پرۆگرام یان پەرتووکی سەبارەت بە پرۆگرام. لە کۆمپیوتەرەکاندا "ویجیت" بەشێکە لە ناوبەستێکی گرافیکیی بەکارهێنەر "a graphical user interface" کە زانیاری پیشان دەدات یا شێوازێکی دیاریکراو دەکات بۆ بەکارهێنەرێ کە "کارلەیەککردن "interact" بکات لەگەڵ "سیستەمی کارپێکردن operating system" و "کاربەری application")

**window** پەنجەرە، دەلاقە

**window-driven interface** ناوبەستی پەنجەرەئاژۆ، ناوبەستی وێنۆچکەئاژۆ

**Windows** (= Microsoft Windows = MS Windows) "ویندۆز"، ویندۆزی مایکرۆسۆفت، "ئێم ئێس ویندۆز" (ناو. ناوی بازرگانی. بەناوبانگترین نەرمەواڵەی سیستەم، بۆ گچکەپێژمێرەکانی "IBM". ئەم جۆرە سەرەکییانەی هەیە: ""Windows 7، "Vista"، "XP"، "2000"، "ME"، ""NT، "98"، "95"، "X3")

**WINS (=** Windows Internet Naming Service**)** (WINS)، "وینس"، "وینز"، ڕاژەی ناونانی ئینتەرنێتی ویندۆز (بەشێکە لە ڕاژەکارەکانی مایکرۆسۆفت ویندۆز "NT" و مایکرۆسۆفت ویندۆزی "2000"، کە کۆمەڵەی ناوی وێستگەی کارەکان و شوێنەکان لەگەڵ ناونیشانەکانی کۆنووسی ئینتەرنێت، ڕێک دەخات بێ ئەوەی هیچ بەکارهێنەرێ یان بەڕێوەبەرێ دەستی هەبێ لە هیچ گۆڕانکارییەکی ڕێکخستندا)

**Winsock** (Winsock)، "وینسوک"

(ناوبەستێکی پرۆگرامکردن و پرۆگرامێکی پاڵپشتیکردنە کە "داواکان

requests"ی "تێچوو/ دەرچوو input/output" بۆ "بەکاربەرییەکانی ئینتەرنێت Internet applications" لە سیستەمێکی کارپێکردنی ویندۆزدا، جێبەجێ دەکات)

**wireless** بێسیم، بێتەل

**wizard[1]** فێرکار، ئامۆژگار، بلیمەت، شارەزا، "مامۆستا"، جادووگەر، "ویزارد" (ناو. پرسیار و وەڵامی ئامۆژگاری و ڕێنوێنی. جۆرە "help"ێک یان بەشێک لە "help"ێک، کە لە پێشدا لە بەکاربەرەکە پرسیار دەکات و پاشان بەپێی وەڵامی بەکاربەرەکە، ئامۆژگاری و ڕێنوێنییەکی تایبەتی پێشکەش دەکات. نموونەیەک لەوە لە نەرمەواڵەی "وۆرد"دا هەیە)

**wizard[2]** "ویزارد"، مامۆستا (ناو. زاراوەیەکی نافەرمی کە بە کەسێک دەوترێ کە لە بەرنامەسازی یان کارە کۆمپیوتەرییەکانی تردا، کار و کردەی زۆر بەرچاو دەکات)

**WLAN** (= Wireless LAN) "لان"ی بێتەل (بێتەل لە تۆڕێکی ناوخۆییدا)

**Word** پرۆگرامی وۆرد

**word processing** وشەڕێکخەری (نووسین و گۆڕان و دەسکاریکردن و چاپی پیت و وشەکان بە نەرمەواڵەی کۆمپیوتەریی تایبەتمەند)

**word processor** وشەڕێکخەر (نەرمەواڵەیێ تایبەت بە وشەکاری و وشەڕێکخەری)

**World Wide Web** (= www)

**World Wide Web Consortium** (= W3C)

**workstation** وێستگەی کار

**worm** کرم (ی کۆمپیوتەر)، (هاوشێوەی ڤایرۆس)

**writable** شیاوی نووسین (نووسین لەسەر پەپکە یا پەڕگەیەک کە پارێزراو نەکرابن لە نووسین و گۆڕینکاری)

**www** (= world wide web) (www)، "ووو"، "وێب"،

وێبی جیهانبەرین، جیهانی وێب (ئەوڕۆکە ئەم دەستەواژەیە بە کردەوە بەرانبەر بە "وێب Web" بەکار دەبرێت)

**WYSBYGI** (= What You See Before You Get It) ‏(WYSBYGI)، "ویزبیگی" (ئەوەی کە لە پەردەپیشان یان مۆنیتۆرەکە دەبینرێ پێش لەوەی لە چاپگەر دەرکەوێ)

**wysiwyg** (= what you see what you get = WYSIWYG = wizzywig) ‏(wysiwyg)، "ویزیویگ" (تایبەتمەندیی نەرمەواڵەیەک کە تیایدا، هەرچی لە پەردەپیشاندا، نیشان دەدرێت، هەر ئەوەیە کە لە چاپگەرەکەدا دەقاودەق چاپ دەبێت)

# X, x

**X.21** ئیکس-٢١ (جۆرە پرۆتۆکۆلێکی پێوەندییە)

**X.25** ئیکس-٢٥ (جۆرە پرۆتۆکۆلێکی پێوەندیییە)

**X.400** ئیکس-٤٠٠ (جۆرە پرۆتۆکۆلێکی پێوەندیییە)

**X.500** ئیکس-٥٠٠ (جۆرە پرۆتۆکۆلێکی پێوەندیییە)

**X.75** ئیکس-٧٥ (جۆرە پرۆتۆکۆلێکی پێوەندیییە)

**x86** (x86)، ئیکس ٨٦

(ناوێکی گشتییە بۆ "زنجیرەی خێزانەکانی میکرۆپرۆسێسووری ئینتێل "series of Intel microprocessor families" کە بە میکرۆپرۆسێسووری 80286 دەستی پێ کرد)

**xclient** (xclient)

(ڕاژەخوازێکی "RuneScape"ە کە لەبەرگرەوەی کۆمەڵە ئامرازێکی ڕێکخستن و "ڕووکار interface"ێکی دڵگیرە)

**XDSL** (XDSL)، "ئێکسدیئێسئێڵ"

(مەبەست لە هەموو جۆرەکانی تەکنەلۆژیای "DSL"ە کە ئەمانە دەگرێتەوە: SDSL, HDSL, ADSL, SLDSL)

**Xenix** سیستەمی کارپێکردنی "کسێنیکس"

جۆرە سیستەمێکی کارپێکردنە لە خێزانی UNIX بنچینەی گرتووە. ئەم سیستەمە وەشانێکی تایبەتی UNIXـە کە لەسەر کۆمپیوتەری کەسی PC دادەمەزرێت. Xenix یەکێکە لە بەرهەمەکانی مایکرۆسۆفت.

**XHTML (**= Extensible Hypertext Markup Language)

(XHTML)، "ئێکسئێچتیئێمئێڵ" زمانی هێمادانانی

سەروودەقی پەرەسەندنێتی (پاشهاتووی "HTML"ە، ستانداردی نوێیە
کە لەلایەن "W3C" دانراوە بۆ ئەوەی پەرەوێبییەکان دیاری کرێن)

**XML** (= Extensible Markup Language) (XML)، "ئێکسئێمئێڵ"،
زمانی هێمادانانی پەرەسەندنێتی (جۆرە زمانێکی بەرنامەدارێژیی
ناستاندارد بۆ ئەو بەڵگەنامانەی لەبەرگرەوەی زانیاریی پێکهاتەن)

**Xmodem** "ئێکس-مۆدێم" (جۆرە پرۆتۆکۆلێکی گواستنەوەی پەڕگە کە
لە پێوەندییە ناهاوهەنگاوەکاندا بەکار دەبرێت)

**XOR** (= exclusive OR) "ئێکس-ئۆر"، "یای پاوانی"

**XPath** (XPath)
(زمانێکە کە ڕێگەیەک ڕاڤە دەکات بۆ شوێندۆزینەوە و ڕەوتی دانەکان لە
زمانی هێمادانانی پەرەسەندنێتی "XML")

**XQuery** (XQuery)
(تایبەتمەندییەکی "پرسە زمانێک a query language"ە کە وا
دەکا کە بەکارهێنەرێ یان بەرنامەدانەرێ زانیاری دەربهێنێ لە
پەڕگەیەکی زمانی هێمادانانی پەرەسەندنێتی یان لە هەر کۆمەڵە
زانیارییەک کە دەتوانێ بە شێوەی "XML" بێت)

**xserver** (xserver)
(ڕاژەکارێکی پێوەندبوونەکانە بە "X terminal"ەکان لە ڕایەڵەیەکی
دابەشکاری، کە "X Window System" بەکار دەبات)

**XSL (=** Extensible Stylesheet Language**)** (XSL)،
"ئێکسئێسئێڵ"، زمانی شێوازەپەڕەی پەرەسەندنێتی (زمانێکە
بۆ ئافراندنی "شێوازەپەڕە Stylesheet"یەک کە پێناسە دەکات چۆن دراوە
ناردراوە لەسەر وێبدا بە بەکارهێنانی "XML"، دەبێ بناسێنرێت بە
بەکارهێنەر)

# Y, y

**Y**[1] بۆچی، وای، بەرامبەر وشەی (why)ی ئینگلیزی

**Y**[2] بەڵێ، بەرامبەر وشەی (yes)ی ئینگلیزی (لە زۆر بەرنامەدا وەکوو وەڵام چاوەڕوان دەکرێ کە پیتی y دابگیرێت بۆ وەڵام بە بەڵێ بۆ کردارێک)

**Y2K** (= Year 2000) وای-توو-کەی، وای‌تووکەی (ساڵی ٢٠٠٠)

**YaST (=**Yet another Setup Tool**)** (YaST) ("هێشتا ئامرازی دامەزرانی تر" بەشی بەڕێوەبردن و ڕێکخستنە لە سیستەمی لینوکسی SuSE دابەش دەکرێت، کە کۆمپانیای SUSE Linux Products GmbH ئەڵمانی بەرهەمی دەهێنێت. YaST وەشانی جیاجیای هەیە)

**Ymodem** (Ymodem) (کۆنووسێکی هەڵەچێکەرە بۆ مۆدێمێ کە ڕادەیەکی زۆری دراوە بەکار دەبات بۆ زۆرتر کردنی چالاکی)

**Ypserver (=** Yellow Pages Server**)** (ypserver) (ڕاژەکاری لاپەڕە زەردەکان)

**yy (= yy command)** (yy) (فرمانێکە لە نووسەری vim بۆ ڕوونووسکردنی دەق بەکاردەبرێت)

# Z, z

**Z** = impedance

**Z80** زێد-هەشتا (ناوی بازرگانی. یەکێک لە گچکەڕێکخەرە ٨بیتییەکانی سەرەتایی، چێکراوی بەشگەی زایلاگ)

**Z8000** زێد-هەشت هەزار (ناوی بازرگانی. یەکێک لە گچکەڕێکخەرە ١٦بیتییەکانی سەرەتایی، چێکراوی بەشگەی زایلاگ)

**zap** سڕینەوە (سڕینەوەی زانیاری لە بیرگە، بەتەواوەتی)

**Zapf Chancery** زەپف چانسری (لە پیتچنیندا، جۆرێک لە جۆرەپیتەکانی لاتین، کە لە شێوەی پیتی دەستنووسە)

**z-axis** تەوەرەی "زد" (تەوەرەی قووڵایی)

**z-coordinate** تانوپۆی "زد"

**zero** سفر

**zero-access stroage** بیرگەی سفر-دەستپێگەیشتن

**zero-address** بێناونیشان، سفرناونیشان

**zero-addressed** سفرناونیشانی

**zero-addressed machine** مەکینەی سفرناونیشانی (پێژمێر بە سیستەمی سفرناونیشانی)

**zero-addressed instruction** = addressless instruction

**zero condition** (= nought state = zero state) دۆخی سفر (لە بیرگە)

**zero-crossing** لە سفرپەڕینەوە

**zerodivide** (= zero-divide) دابەشبوون بە سفر

**zero element** توخمی سفر

**zerofill** (= zero fill) پڕکردنەوە بە سفر

**zero flag** نیشانەنوێنی سفر

**zero insertion force** (= ZIF) تەوژمی دامەزراندنی سفر، "زیف" (هی پارچە ئەلەکترۆنیکییەکان، کە بۆ دامەزراندنیان پێویست بە تەوژم ناکات)

**zero-insertion-force** (= ZIF) بێنیاز-لە-تەوژمی "زیف" (هی شێوەی "تەوژمی دامەزراندنی سفر")

**zeroization** سفراندن، سفرگەری، سفرسازی (لە پاراستنی دراوەکاندا، سفراندنی تەواوی بیرگە)

**zerolevel** ئاستی سفر، ئاستسفر

**zero-level classification** پۆلپۆلکردنی ئاستی سفر

**zetetics** زانستناسی، زانستزانی، زێتێتیک (لە زانستزانی و فێرکردندا، خوێندنەوەی زانستی مرۆڤایەتی و توێژینەوەی لێکۆڵینەوە و لێهاتوویی تیایدا)

**ZIF** = zero insertion force

**ZIF socket** پایەگری زیف، پایەگری پێویستنەبووی تەوژم

**zine** (= ezine = electronic magazine) "زین"، گۆڤاری ئەلەکترۆنی

**zip** "زیپ"، چەسپکراو، دراوەی چەسپکراو

**zip file** پەڕگەی چەسپکراو (پەڕگەیەکە کە پەڕگەیەک یا چەند پەڕگەیەکی تێدایە بەچەسپکراوی)

**Zmodem** (= Z-MODEM) ز-مۆدێم (کۆنووسێکە بۆ گواستنەوەی دراوە و پەڕگە بە شێوەی پارێزراو)

**zone** ناوچە

**zone bit** بیتی ناوچە

**ZOO** جۆرە درێژکراوەیەکی پەڕگە

**zoom** زووم، وردبینیدانان
**zoomable** زوومکردەنی
**zoom in** زوومکردنی زێدەیی
**zooming** گەورەنوێنی، زوومگەری، وردبینیدانان
**zoom out** زوومکردنی ڕۆچوونی، لە زووم دەرچوون، زووم لابەر

**Zv-Port (**=zoomed video port**)** (ZV-Port) (ئەو بەشەیە port کە لەڕێگەیەوە دراوە data و زانیاریی ڕاستەوخۆ دەگوێزرێتەوە لە خودی بژمێرەکەوە PC بۆ کارتی نیشاندەر VGA.)

کۆتایی

